عارف قوربانی






# واحێد کۆچانی

دەربازبووی گۆڕە بە کۆمەڵەکانی ئەنفال

# واحید کۆچانی
# دەربازبووی گۆڕەبەکۆمەڵەکانی ئەنفال


- نووسەر: عارف قوربانی
- چاپی یەکەم –٢٠١٣
- پیتچنین: رەوەند کەریم
- بەرگ: ئارام شوانی
- چاپخانە: چاپخانەی کمال
- تیراژ: (٥٠٠)

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە(١٥٧٧)ی ساڵی ٢٠١٣ ی پێدراوە





سەرپەرشتیاری کتێب: مژدە عباس
لەسەر ئەرکی دکتۆر تەها رەسوڵ چاپکراوە

سودو سەرمایەی بڵاوکراوەکانی سەنتەری مارگرێت
بۆ کەس و کاری شەهید و ئەنفالکراوەکانە

## پێشکەشە بە

## ئەنوەر تەیار

ئەو پێشمەرگە ئەنفالکراوەی ناوچەی قادرکەرەم کە لەپەلامارەکانی ئەنفال بۆ سەر کورد، لە قادرکەرەم کەوتە دەستی سوپای عیراق و لەگەڵ هەزاران رۆڵەی ئەم میللەتە گوێزرانەوە بۆ کەمپەکانی دەستبەسەرداگرتن و لەوێوە رەوانەی خوارووی عیراق کران بۆ گوللەبارانکردن.

ئەنوەر تەیار لە بیابانەکانی نزیک ( رومادی ) لە شوێنی بەکۆمەڵکوشتنی ئەنفالەکان لە ناو سەیارەیەکی سەرداپۆشراودا بەرلەوەی دایانبگرنە خوارەوە بۆ کوشتن، سەرکردایەتی راپەڕینێکی کرد و لە دژی تیمی گووللەبارانکردنەکانی ئەنفال راپەڕین.

بە هۆیەوە چەند گەنجێکی کورد لە گوللەبارانرکردن رزگاریان بوو، لە بیابانەکانەوە بە برینداری گەڕانەوە کوردستان و زانیاریی چۆنێتی بەکۆمەڵکوشتنی ئەنفالەکانیان هێنایەوەو لای خواو لە دادگای باڵای تاوانەکانی عیراق بوونە شایەتحاڵی بەکۆمەڵکوشتنی گەنجەکانی کورد.

## دەستپێک

یەکێک لە تایبەتمەندیەکانی کارکردنم لەسەر ئەنفال ئەوە بووە هەمیشە هەوڵم داوە بۆ تۆمارکردنی روداوەکانی ناو ئەنفال پشت بە ڕاستگۆترین سەرچاوە ببەستم و دەست بەرم بۆ باشترین بەڵگە، کە بەلای منەوە شایەتحاڵەکانی ئەنفال ئەوانەی بەشێوەی راستەوخۆ لەناو کورەی ئاگرەکەدابوون، خۆیان باشترین و راستگۆترین سەرچاوەی گێڕانەوەی روداوەکەن. لایەنێکی تری ئەو کارکردنەش بۆ ئەوە دەگێڕمەوە کە ئەنفال وەک کردە، تاوان، پرۆسەیەکی وەحشیگەریانەی بێوێنەی مێژووی مرۆڤایەتی، نەک نەتوانراوە وەکوو خۆی تۆمار بکرێت، بەڵکوو لە ماوەی ئەم چەندین ساڵەی دوای ئەنفالدا بە ئەندازەیەک فەرامۆش کراوە کە زۆر راستی و روداوی ناو ئەنفال شێوێندراون و نەبونی سەنتەری لێکۆڵینەوە و ئەکادیمی بۆ تۆمارکردنی وردو درشتی ئەنفال و هەوڵدان بۆ بە ئەرشیفکردنی، وایکردووە کە زۆر نهێنی و زانیاری لەگەڵ مەرگی ئەنفال دیدەیەکدا بچێتە ژێرگڵەوە.

بڕوایشم وابووە ئەم فەرامۆشکردنەی ئەنفال بۆ هەتا هەتایە وانابێ و رۆژێک دێت خەمخۆری زیاترو دڵسۆزتر پەیدادەبن و لەڕوی زانستی

دیکۆمێنتکردن و توێژینەوەوە شارەزاتردەبن و زەروریەتی خوێندنەوەی ئەنفال وادەکات چەندین ناوەندی ئەکادیمی و لێکۆڵینەوەو بە دیکۆمێنتکردن دابمەزرێت، کە بۆ ئەو ڕۆژە بەکەڵکترین سەرچاوەو پێویستترین بابەت بۆ سەرلەنوێ دراسەکردنەوەی ئەنفال، قسەوباسی شایەتحاڵەکانی ئەنفال خۆیان دەبن. ئەوانەی لەناو ڕوداوەکەدا بوون، ئیتر چی جەلاد بووبن یان قوربانی.!

بۆیە ئەرکی ئێمەومانانی قەڵەم بەدەستی ئەم قۆناغەیە وەک خۆمان ناتوانین خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی هەمەلایەنە بۆ ئەنفال بکەین، هیچ نەبێ دەبێ ئەوەندە کەرەستە بەرینە مێژووەوە بۆ نەوەکانی داهاتومان تاوەکوو سودی لێوەرگرن بۆ نوسینەوەی ئەو مێژووە خوێناوییەی میللەتەکەمان.!

لەم ڕوانگەیەوە ئەوەندەی پێم کرابێ هەوڵمداوە بە ئەمانەتەوە بەشێک لە شایەتحاڵەکانی ئەنفال بدوێنم و ئەوەی لە زاکیرەی ئەواندا ماوەتەوە بەر لەوەی بیبەنە ژێرگڵەوە وەکوو خۆی بیانخەمە ناو لاپەڕەکانی مێژووەوە بۆ ئەو دووا ڕۆژەی کە کورد پێویستێتی دەستیان بۆبەرێت. هەرچەندە بڕوایشم وایە بۆ ئەمڕۆیش یەکێک دەبێت لە بابەتە پێویستەکانی کتێبخانەی کوردی.!

ئەم چاوپێکەوتنەی (واحێد کۆچانی) دەربازبووی گۆڕەبەکۆمەڵەکانی ئەنفال، کە خۆی یەکێک بووە لەو ژمارە زۆرە گەنجەی کورد کە بەر ئەنفال کەوتوون و بەرەو چارەنوسێکی نادیار براوون، یەکێکە لەو

هەزاران لاوەی کورد کە ئەنفال هەڵیلوشی، یەکێکە لەو ژمارە کەمەی کە ژمارەیان لە پەنجەکانی دەستمان تێپەڕناکات کە بەڕێککەوت لە گوللەبارانکردنی بەکۆمەڵی ئەنفالەکان رزگاری بووەو بە برینداری گەڕایەوە کوردستان و زۆرترین زانیاری و وردترین روداوی شاراوەی ناو ئەنفالی هێنایەوە و لەزاکیرەیدا پاراستی بۆ رۆژێکی وا کە بتوانێ هەموو وردەکارییەکانی بگێڕێتەوە.

ئەمەی لێرەدا دەیخوێنیتەوە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەنوسیە لەگەڵ ئەو دەربازبووەی ناو گۆڕە بەکۆمەڵەکانی نزیک پارێزگای رومادی.

کە ئەگەر ئەم چەند شایەتحالانە نەبوایان زۆرترین زانیاری و وردەکاری روداوەکانی ناو ئەنفال بۆ هەتا هەتایە بە شاراوەیی دەمانەوە.

ئومێدەوارم نوسینەوەی ئەوەی لە زاکیرەی ئەم شایەتحاڵەدایە، لە ئێستادا بۆ کورد و کتێبخانەی کوردی سودبەخش بێت، کە دڵنیام بۆ دوارۆژ دەبێتە بە کەڵکترین سەرچاوە بۆ سەرلەنوێ نوسینەوەی مێژووی نوێی ئەنفال.

*** با دەروازەی پرسیارەکانم ئەوە بێت داوات لێبکەم خۆت بناسێنی.؟**

– ناوم (واحید محمد سەعید عەبدول)ە، لە 1965/7/1 لە گوندی (کانی قادر)ی بنارگل لە دایك بووم.

*** (کانی قادر) سەر بەچی ناوچەیەکە لە رووی ئیداریەوە ناحیە، قەزا، پارێزگا.؟**

– هەر لە نزیك (کۆرمۆر)ە، سەر بە ناحییەی (قادر کەرەم)، ئەویش سەر بە قەزای چەمچەماڵ بوو.

*** چیرۆکی ژیانی تۆ سەیرە هەر لە گوندەکەی خۆت بوویت و ماوەیەك کەرکوکی بوویت و ماوەیەك سلێمانی و دواجار بوویی بە هاوڵاتیەکی تکریتی شارەکەی سەدام، تۆ ئەوە دەزانی.؟**

– ناوەڵا، ئێمە تا ئەنفال هەر لە (کانی قادر) بووین، بۆ هیچ شوێنێ ماڵمان نەگوێزاوەتەوە ئیتر بۆ بوومەتە کەرکوکی و سلێمانی و تکریتی، (بە پێکەنینەوە).

*** ئەوکاتەی تۆ لەدایک بوویت (قادرکەرەم) سەر بە قەزای چەمچەماڵ بوو لە پارێزگای کەرکوک، واتا تۆ کەرکوکی بوویت. بەڵام دوای ئەوەی حیزبی بەعس هاتە سەر حوکم بە مەبەستی گۆڕینی دیمۆگرافیای ناوچەکە و پاکتاوی رەگەزی کورد دەستکاری یەکە ئیدارییەکانی پارێزگای کەرکوکی کرد، لە ساڵی 1976 کە تۆ تەمەنت 11 ساڵان بوو، چەمچەماڵ خراوەتە سەر پارێزگای سلێمانی ناوچەکەی ئێوەش لە رووی ئیدارییەوە بەسترایەوە بە سلێمانییەوە، بوویت بە هاوڵاتیەکی پارێزگای سلێمانی. دواتر حیزبی بەعس ناحییەی (قادر کەرەم)ی لە (چەمچەماڵ) دابڕی و خستیە سەر دوزخورماتوو، کە ئەویش لە چوارچێوەی هەمان سیاسەتی بەعسدا لە کەرکوکەوە خرابووە سەر پارێزگای (سلاحەدین) واتا تکریت شارەکەی سەدام، تۆش بەو هۆیەوە بووی بە خەڵکی ناوچەی (تکریت).**

— ئا، راست دەکەی بۆ نفوس دەرکردن و ئیش و کاری دائیرەکان هەر ماوەی سەر بەشوێنێ بووین و ئیستاش لەسەر دوزخورماتو ین، بەڵام ئێمە هەقمان نیە بەسەر حکومەتەوە، خەڵکی قادر کەرەم ین و خۆمان بە کەرکوکی دەزانین.

*** وەکوو بزانی، لە باب و باپیرانت بیستبێ، لە کەیەوە لەو ناوچەیە ژیاون.؟**

– تا باپیرە گەورەم دەزانم لە (کانی قادر) ژیاون و گۆڕی ئەویش لە کانی قادرە. بەڵام پێش ئەو لە (کچان) ناوچەی (سەنگاو) دانیشتوون. ڕەنگە پێشتریش هەر لەو دەورووبەرە بووبن، چونکە عەشیرەتمان (زەنگەنەیە) و وەك دەگێڕنەوە زۆر دەمێکە عەشیرەتی (زەنگەنە) هاتونەتە ئەم ناوچانە.

*** با بێینە سەر گوندەکەی خۆتان (کانی قادر)، چەند ماڵ دەبوون.؟**

– وەڵا 35 بۆ 40 ماڵ دەبووین.

*** زۆربەی دانیشتوانی لادێ لەنێوان یەکتریدا خزم بوون، ئایا گوندەکەی ئێوەش وابوو.؟**

– خۆی ژیانی لادێ وابوو ئەگەر خزمیش نەبن چونکە چەندین ساڵ بوو پێکەوە ژیابوون وەك خزم و کەسی یەکتر مامەڵەیان دەکرد، گوندەکەی ئێمە لە چوار بنەماڵە پێك هاتبوو (زەنگەنە) (تاڵەبانی) (گل) (دەلۆ).

*** خوێندنگا یان قوتابخانەی ئاینی(لەکێ) لە گوندەکەتان هەبوو.؟**

– بەڵێ لە شەستەکانەوە خوێندنگەی تیابووە. مزگەوتیشی تیابوو بەڵام نازانم ئەو لە کەیەوە دروستکراوە، لە پێش کردنەوەی قوتابخانەوە تیای بووە. ساڵانە لە مانگی رەمەزان (فەقێ) لە گوندەکانی تریشەوە دەهاتن لای مەلای مزگەوتەکەی ئێمە دەیانخوێند. چونکە خەڵکەکەی ئیمانداربووین و مزگەوت و قوتابخانەشی تیابوو، بە زۆری مەلاکان هەر لە خەڵکی گوندەکەی خۆمان بوون.

*** ئەگەر لەسەر ژیانی خێزانی خۆتان شتێکم بۆ باس بکەی.؟**

– مەبەستت خۆم و خێزان و مناڵەکانمە.؟

*** نا، جارێ مەبەستم باوکت و دایک و خوشک و براکانتە.؟**

– بەڵێ، باوکم لە ساڵی 1912 لە دایك بووە، دایکم زۆر لە باوکم مناڵتر بوو لە دایك بووی ساڵی 1930 بووە. خێزانێکی گەورە بووین، چوار کچ و حەوت کوڕیان بووە. یەکەم مناڵیان ناوی شوکر بووە هەر بە مناڵی مردووە، براگەورەکەم ناوی کاك هیدایت بوو لە دایك بووی ساڵی 1953 بوو، دوای ئەو کاك حەبیب بوو ساڵی 1955، نەبیهە ساڵەکەی نازانم، سەبریە ساڵی 1962 لەدایك بووە، عوبید لە ساڵی 1963 و من

له ساڵی 1965، دوای منیش شەمسەی خوشکم لە 1967 بووە، تەیب برام بوو لە 1968 لەدایك بووە، حسیبە لە 1969 و بچوکترینیشمان سروت بوو لە 1971 لە دایك بووە.

*** خێزانێکی گەورە بوون، بژێوی ژیانتان چۆن بووە، ئەوەندەی بۆتیان گێڕابێتەوە یان ئەوەی خۆت بیرت بێت.؟**

– جاران بەگشتی خەڵك کەم دەرامەت بوو، ژیان وەك ئێستا نەبوو، ئێمەش نە هەژار و نە زۆر دەستڕۆ بووین، ژیانێکی ئاساییمان هەبوو خەریکی کشتوکاڵ و مەڕداری بووین. ناوچەکەمان بۆ فەلاحەت و بۆ ئاژەڵداریش دەبوو، ئێمەش خەریکی گەنم و جۆ و مەرەزە و بەخێوکردنی مەڕو ماڵاتیش بووین.

*** جگە لە یەکەم منالْ ووتت ناوی شوکر بو بە منالی مردووە، ئەوانی تر هەموویان لە ژیاندا ماون.؟**

– ناوەڵا هەموویان نەماون، پێش ئەنفال چوار لە براکانم وەفاتیان کردووە. کاك حەبیب براشم لە ئەنفالەکە تیاچوو، تەنها (سروت) ماوەتەوە و خوشکەکانیشم ماون.

***  مادام قوتابخانە لە گوندەکەتان هەبوویێت کەواتا چوویتەتە بەر خوێندن، ساڵی چەند چوویتە قوتابخانە و تا چەندت خوێندووەو ئاستی خوێندنەوە و نوسینت چۆنە.؟**

–  ساڵەکەیم بیر نیە چی ساڵێك بوو چوومە قوتابخانە، بەڵام دەزانم هەر ئەو ساڵەم خوێند و ئیتر دەرمیان کرد. بەڵام خراپ نیم بەشی خۆم دەزانم شت بخوێنمەوە و زمانی عەرەبی و ئینگلیزیش دەزانم.

***  مامۆستاکان دەریان کردی، یان کەسوکارت.؟**

–  نەوەڵا مامۆستاکان پێیان ناخۆش بوو، کەسوکارم لە قوتابخانە دەریان هێنام .

***  بۆ.؟**

–  وەڵا بڵێم بۆ، کردمیانە لای کاروبەرخ.

***  کاك واحید دەمەوێ پرسیاری ئەوەت لێبکەم هەست دەکەی یادەوەریت لە کەیەوە دەست پێدەکات. یان ئەو شتەی کە لەبیرتە و دەزانی ئیتر هیچ شتێکی پێش ئەوەت بیر نەماوە، چیە.؟**





– هی کات ئەنفالەکە.!

* **نانا، مەبەستم ئەوەیە چیت لەبیرە کە زۆر منداڵ بووی، چی شتێک هەیە دەزانی ئەوە یەکەم بیرەوەریە لات.؟**

– نا، وەڵا ساڵ حەفتام لەبیرە تەمەنم پێنج ساڵان بوو ئەزانم ئەیانووت پێشمەرگە هاتووە بۆ ماڵمان.

* **هیچ پێشمەرگەیەک خەڵکی گوندەکەتان ئەوکات، بریندار یان شەهید بوون، تۆ بیرت بێت.؟**

– وابزانم ساڵی 1973 بووە لە گوندی (خدر وەلی) شەڕێک بووە لەنێوان پارتی و شیوعی، هەندێ پێشمەرگەی شیوعی بەدیل گیراون و گوللەباران کراون، سیانیان خەڵکی گوندەکەی ئێمە بوو، ڕووداوێکی ناخۆش و ترسناک بوو. ئەوکاتە من تەمەنم حەوت هەشت ساڵان بوو زۆر ئەترسام خەڵك کوژرابوو.

* **پێشتر هیچ یادەورەیەکت نیە، ڕووداوێك یان شتێکت بیستبێت، بۆ نمونە شەڕی نێوان شۆڕشی کورد و عیراق تەیارە دابێتی لە گوندەکەتان یاخوود جەیش پەلاماری دابن.؟**

– تا ئەوکاتە هیچ شتی وام نەبیستووە ئەگەر رووشی دابێ من نایزانم، بەڵام بیرمە ساڵی 1975 رژێمی عیراق بە تەیارە (ناپاڵم)ی دا لە گوندەکەمان، کەسی نەکوشت بەڵام وابزانم مەڕوماڵات زیانی بەرکەوت.

*** ئێ ئەوکاتە تۆ تەمەنت دە ساڵان بووە گەورە بوویت، ساڵ 1975 شۆڕش هەرەسی هێنا، هەستی ئەوکاتەی خۆلت بیرە هەستت بەچی دەکرد، یان وەک بیرت بێت خەڵک چیان دەوت لەو بارەیەوە.؟**

– وا ئەزانم ئێستایە پێشمەرگە دەهاتەوە چەکیان فڕێ دەدا و جنێویان ئەدان ئەیانووت شۆڕش تاوایەوە.

*** جنێویان بەکێ ئەدا.؟**

– بە ئێران.

*** شۆڕش لەبەرانبەر عیراق شکستی خواردبوو، وەک بزانی بۆ جنێویان بە ئێران ئەدا.؟**

– ئێ ئێ ئەزانم، ئەیانووت ئێران خیانەتی لە کورد کرد بۆیە شۆڕشەکە تاوایەوە لەبەر ئەوە قسەیان بە ئێران دەکرد.

***    پێشمەرگەی کوێ بوون کە دەهاتنە گوندەکەی ئێوە و چەکیان فڕێ دەدا.؟**

– پێشمەرگەی پارتی بوون.

***    دەزانم پارتی بوون، بەڵام بۆ دەهاتنە گوندەکەی ئێوە.؟**

– هەر خەڵك گوندەکەی خۆمان بوون.

***    گوندەکەتان چەند پێشمەرگەی تیابوو.؟**

– ئەوکاتە کورد زۆربەی هەرە زۆری لایەنگری شۆڕش بوو، خەڵکی لادێکان زۆری پێشمەرگە بوو، گوندەکەی ئێمە دەوری 30 پێشمەرگەی هەبوو، هەندێکیان شیوعی بوون و هەندێکیان پارتی بوون.

***    پێشمەرگە شیوعی و پارتییەکانی گوندەکەتان پێکەوە بوون.؟**

– نانا، پێکەوە نەبوون، مەبەستم لەوە بوو کە خەڵکی دێیەکەمان چەکداری ئەم دوو لایەنە بوون.

***    ئەوکاتانە ئیتر تەمەنی تۆ بەرەو گەنجی دەڕۆیت، هێشتا لەماڵەوە هەر دەیانکردیتە لای کارو بەرخ.؟**

– دەمێك بوو لای كارو بەرخ نەمابووم، لە لادێ عادەت وابوو منداڵێك كە هێشتا نەتوانێت كاری تر بكات، ئاسانترین ئیش ئەوەبوو لەگەڵ كاروبەرخ بڕوات، بەڵام كەمێك گەورە بوو ئیتر كارەكەشی دەگۆڕا بۆ ئەركێكی گەورەتر و قورستر، من ئەوكاتانە خەریكی ئیش و كاری ماڵ بووم یارمەتی باوك و براكانم دەدا و ماڵ و میوان و ئەو شتانەیان پێدەكردم، تا بیرمە لە ساڵی 1979 یەكەمجار بوو ناردمیان بۆ كرێكاری بۆ كەركوك و لێرەوە گۆڕانكارییەك بەسەر ژیانمدا هات لە ئەرك و ژیانی جوتیاری لادێ وە بووم بە كرێكار لە شار.

*** پێشتر چووبویتە كەركوك و شارەزا بوویت.؟**

– ماڵ مامم لە كەركوك بوو، خوشكێكیشم شوی كردبوو بە ئامۆزایەكم سەردان و هاتووچۆمان هەبوو.

*** لە كەركوك لە شوێنێك دامەزرای، یاخود كرێكاری رۆژانەت دەكرد.؟**

– سەرەتا وەك كرێكار دەچوومە مەیانی كرێكارەكان، ماوەیەك كرێكاریم كرد و دواتر بووم بەشاگردی ئامۆزاكەم ناوی (عاسی) بوو، كە

هەم زاواشم بوو وەستای کاشی بوو منیش بووم بە شاگردی بەردەستی ئەو. تا ساڵی 1982 وەك شاگرد کارم کرد و لە 82 بووم بە وەستا.

*** ئەو چەند ساڵە هەر لە کەرکوك کارت دەکرد.؟**

– وەستا (عاسی) بە قۆنتەرات ئیشی دەگرت لە هەر شوێنێ بوایا. بەڵام بە زۆری لە کەرکوك و ماوەیەکیش لە تکریت ئیشمانکرد.

*** عەرەبیت دەزانی.؟**

– زۆر باش نەبووم بەڵام ئیشی خۆم پێ بەڕێدەکرد.

*** ساڵی 1983 بەپێی ساڵی لەدایك بوونت تەمەنت دەگەیشتە 18 ساڵ، وە لە عیراق ئەوەی تەمەنی بگەیشتایا بە 18 ساڵ دەبوو ببوایەتە سەرباز، تۆ چیتکرد.؟**

– پێش ئەوەی شەڕی ئێران و عیراق دەستپێبکات، خەڵك کە ناوی دەهاتەوە بۆ سەربازی دەچوو دەبووە عەسکەر، دوو سێ ساڵ سەربازی دەکرد و دەگەڕایەوە، تەنانەت وەك عادەتی لێهاتبوو لەناو خەڵکا دەیانووت هێشتا نەبۆتە پیاو عەسکەری نەکردووە. کەسێك بیویستایا ژن بهێنێ دەیانووت با ماوەی سەربازی تەواوکات ئەوجا کاتی ژن هێنانێتی.

بەڵام کە شەڕ دەستیپێکرد ئیتر ئەوەی دەبووە عەسکەر یان دەکوژرا یان بەدیل دەگیرا یان کەم ئەندام دەبوو، یان دەبوو هەر سەرباز بێت و کۆتایی نەبوو، ئێمەش باوەڕمان بەوە نەبوو بچین خۆمان بۆ ئەو حکومەتە بدەینە کوشت، بەتایبەتیش بەهۆی ئەوەی لادێکان ناوچەی ئازادکراو بوون و پێشمەرگەی لێبوو، خەڵك بە تایبەت کورد بە زۆری (فیرار)ی دەکرد و لە لادێکان دەمایەوە. منیش کاتێ ناوم هاتەوە بۆ سەربازی گەڕامەوە بۆ گوندەکەی خۆمان.

*** باسی ژن هێنانت کرد، تۆ کەی خێزانت پێکەوەنا.؟**

– ساڵی 1984

*** هەر لە گوندەکەی خۆتان کەسێکت دەستنیشانکرد، یان لەشوێنی تر بوو.؟**

– خەڵکی گوندی (قیرچە) بوو، دواتر ماڵی باوکی باریان کردبوو بۆ قادرکەرەم و کەرکوك. باوکی دوو ژنی هەبوو دایکی و دوو برای و خوشکێکی لە کەرکوك بوون و باوکی و ئەوانی تر لە قادرکەرەم. برایەکیشی هەر لە (قیرچە) مابوەوە تا لە ئەنفالەکە ئەویش تیاچوو.

*** منداڵتان بوو.؟**

– بەڵێ، سێ منداڵمان بوو، یەکەم منداڵمان لە ساڵی 1985 لە دایك بوو ناوی (هیمن)ە ئێستا ماوە لەژیاندا و لە ئەمریکا زانکۆ دەخوێنێت. دووەم منداڵمان لە ساڵی 1986 لەدایك بووی ناوی (ڕێبوار)ە، ئەویش هەر لە ئەمریکا خوێندکارە. سێیەم منداڵیان لە ساڵی 1987 لەدایك بوو ناوی (هاوار)بوو، لە کاتی ئەنفالەکە بەهۆی رەمیکردنی کۆپتەرەوە لە مەلجەئێکدا مرد.

*** پێشتر باسکرد کە براکانت بەوجۆرە وەفاتیان کرد، دایك و باوکت تاکەی لەژیاندا مابوون.؟**

– باوکم لە ساڵی 1985 کۆچی دوایکرد و دایکم مابووەوە تا ئەم دواییانە لە ساڵی 2005 وەفاتیکرد.

*** ووتت لە ساڵی 1983 لە کەرکوك گەڕایتەوە، شوێنی گوندەکەتان ناوچەیەکی ئارام بوو، تا بتوانی لە دەستی حکومەت خۆت لەوێ حەشاردەیت.؟**

– بەڵێ، جگە لەو گوندانەی زۆر نزیکی جادە و شارەکان بوون، هەموو گوندەکان شوێنی ئەوەبوون بە سەربەستی تیایا بژیت.

چونکە ناوچەی ئازادکراوبوون و بەدەستی پێشمەرگەوە بوون. گوندەکەی ئێمەش کەوتبووە قوڵایی چەند گوندێکی ترەوە، واتا چەند گوندێکی تر کە هەموویان هەر ئازاد بوون لە دەوری گوندەکەمان بوو، بەو هۆیەوە زۆر بێ خەم و بێ ترس بووین لە حکومەت.

*** بووی بە پێشمەرگە یان وەک سەربازێکی هەڵاتوو لەماڵی خۆتان مایتەوە.؟**

– زیاتر لە ساڵێك وەك فیرار مامەوە. لەساڵی 1984 (ی.ن.ك) بڕیارێکی دەرکرد کە هێزی پشتگیری دروستکات لە گوندەکان، لە گەنج و لاوانی گوندەکان و لەو سەربازە هەڵاتوانەی لە شارەکانەوە پەنایان دابووە لادێکان، ئیتر بووم بە هێزی پشتگیری.

*** بڕیارەکە بە زۆر بوو یان ئارەزوو مەندانە.؟**

– وەڵا وەك زۆر بەزۆر نەبوو، بەڵام ئەو ماڵەی پێشمەرگە یان شەهیدی هەبوایا ئەوە داوای لێناکرا، ئەگەر نەیبوایا پێیان دەووت ببە بە هێزی پشتگیری. لە راستیا چونکە بۆ پاراستنی ژیانی خۆت و پارێزگاری

گوندەکە بوو، خەڵکەکە خۆشی حەزی دەکرد، ئەوەی دەستی تفەنگی بگرتایا و ئیمکانیاتی چەك کڕینی هەبوایا خۆی دەبووە هێزی پشتگیری.

*** دەبوو خۆتان چەك بکڕن.؟**

– بەڵێ هەرکەس دەبوو خۆی چەك و فیشەك بکڕێت و شۆڕش چەکی بەکەس نادا.

*** ئەی بۆ نەدەبوون بە پێشمەرگە، کە هەر ناچاربوون چەك هەڵگرن، جیاوازی چی بوو لەنێوان هێزی پشتگیری و هێزی پێشمەرگە.؟**

– پێشمەرگە دەبوو لە مەفرەزە یان لە کەرتێکدابیت و شوێن و مەکانیان نەبوو، هەر رۆژەی لە ناوچەیەك جەولەیان دەکرد. بەڵام هێزی پشتگیری هەر لە گوندەکەی خۆت و ئەوپەڕی بۆ چەند گوندێکی تر دەچوویت، بۆ خێزاندار و ئەوانەی کە کەسوکاریان نەیان دەهێشت لێیان دوورکەونەوە هێزی پشتگیرییەکە وەك ئەوە وابوو تۆ هەر لەماڵەکەی خۆت بیت.

*** ئێ کە هەر لەماڵەکەی خۆت و لە گوندەکەی خۆتان بوون، بۆچی کرابوون بە هێزی پشتگیری.؟**

– ئەزانی چۆن بوو، پێشمەرگە زۆرجار دەچوون بۆ چالاکی و جەولە بۆ ناوچە دوورەکان، یان دەچوون بۆ سەرکردایەتی، تەنانەت ماوەیەك پێشمەرگەی ئەو سنورانەی ئێمە بران بۆ شەڕی پشتیوانی لە کوردستانی ئێران، هێزی پشتگیری بۆ ئەوە بوو کاتێ پێشمەرگەش لەناوچەکە نەمایا، ئەوە هێزێك هەبێ شوێنیان بگرێتەوە.

*** ئەمە هەر بۆناوبوو یان لەڕووی کردارییشەوە شوێنی پێشمەرگەی دەگرتەوە.؟**

– بەفعلی شوێنی پێشمەرگەی دەگرتەوە، پێش ئەوەی هێزی پشتگیری دروستبکرێت کاتێ پێشمەرگەی ناوچەکە بە واجب بچونایەتە سەرکردایەتی یان بۆ شەڕێك بچوایان و ناوچەکەیان جێبهێشتایا، ئەوە مەفرەزەی جاش دەهاتنە سەر گوندەکان و راوڕوتی خەڵکیان دەکرد و خەڵکیان دەگرت، بەڵام کە هێزی پشتگیری دروست بوو ئیتر پێشمەرگەش لەو ناوچانە نەبوایا جاش و جەیش بە ئاسانی نەیان ئەوێرا بێنە ناوچەکە چونکە دەیانزانی هێزی لێیە. وە زۆرجاریش پەلاماری

گوندەکان دراوە و یەک پێشمەرگە لەو ناوچەیە نەبووە تەنها هێزی پشتگیری گوندەکان خۆیان توانیووانە بەرگری بکەن.

***   لەو ماوانەی کە تۆ هێزی پشتگیری بوویت تا ئەو کاتەی پەلاماری ئەنفال دەستپێکرد، هیچ جارێک جاش و سوپا پەلاماری گوندەکەی ئێوەی داوە و ئێوە بەشداریتان کردبێت لە پارێزگاری گوندەکەی خۆتان.؟**

–   نا، لەبەر ئەوەی دێیەکەی ئێمە کەوتبووە ناوەڕاستی ژمارەیەک گوندی ترەوە، حکومەت نەیدەتوانی بێتە سەر ئێمە، دەبوو بەسەر ئەو گوندانەی تردا بهاتایا، لەهەر گوندێکیش هێزی پشتگیری هەبوو، پێشمەرگە لەناوچەکەبوون بۆیە نەیدەتوانی بگاتە لای ئێمە.

***   ئەی هیچ جارێک لەو گوندانەی دەوروبەرتان شەڕ رووی داوە، پەلامار دراون و ئێوە چووبێتن بە هاواریانەوە بۆ پشتیوانیان.؟**

–   بەڵێ، بەتایبەت لەم ساڵانەی دوایی کە هێزی پشتگیری زۆر بوو بوو بەهۆی ئەوەی ساڵ لەدوای ساڵ مەوالید بانگ دەکرا بۆ سەربازی، تەنانەت نەک گەنج تەمەنە گەورەکانیش مەوالیدیان داوا دەکرا بچنە ریزی

سوپاوە، خەڵکی لادێکان و زۆرێکیش لە شارەکانەوە فێراریان دەکرد دەهاتنە دێهاتەکان، بەوهۆیەوە هێزی پشتگیری زۆر زیادی کردبوو وەك پێشمەرگە بەناوچەکاندا جەولەمان دەکرد و هەر هەواڵێ هەبوایا کە جەیش و جاش رەنگە پەلاماری فلانە گوند بدەن، هەرچی هێزی پشتگیری ئەو ناوچەیەیە لەوێ کۆدەبوونەوە بۆ بەرگریکردن. چەندین شەڕ هەیە کە یەك پێشمەرگەی تیانەبووە و هێزی پشتگیری خۆی بەرگری لە ناوچەکە کردووە. تەنانەت دەچووینە ناوچەکانی تریش، لە کفری لە سەرقەڵا لە دوزخورماتوو، هەرجارێ لە (نەوجولەوە)جەیش دەربچوایا بۆ هەر ناوچەیەك ئێمە هێزی پشتگیری گوندەکان دەچووینە پێشی و رێگەمان لێی دەگرت تا پەلاماری گوندەکان نەدات.

*** ئەی هیچ جارێک هێزی پشتگیری و هێزی پێشمەرگە پێکەوە بەشداریتان کردووە لە ئەنجامدانی چالاکیەک یان بەرگریکردن لە ناوچەیەک.؟**

– بەڵێ، بۆ شەڕی (توکن، عەزیز قادر، وارانی، زینانە) لە هەموو ئەم شەڕانەدا بەشداریمان کردووە.

*** هیچ کەس لە هێزی پشتگیری بریندار یان شەهید بوو لە شەڕەکاندا.؟**

– لە ساڵی 1988 لە شەڕی بەرگریکردن لە (تازەشار) کوڕێك ناوی (عادل) بوو خۆی خەڵکی تازەشار بوو، لە هێزی پشتگیری بوو شەهید بوو.

*** ئێوە تەنها لەوکاتانە ئامادە دەبوون کە هەواڵێک هەبوو، یان دەتانزانی سوپا پەلاماری گوندێک دەداو ئێوەش دەچوون بۆ بەرگریکردن.؟**

– سەرەتا وابوو، بەڵام بەم دوادواییە وەك پێشمەرگە جەولەمان دەکرد و دێهاتەکان دەگەڕاین.؟

*** مامەڵەی خەڵکی گوندەکانی ناوچەکانی تر چۆن بوو، لەگەڵتان.؟**

– هەروەك پێشمەرگە مامەڵەیان لەگەڵمان دەکرد، تەوزیع دەبووین لەماڵەکان و شەوان لە مزگەوت یان لە چەند ماڵێك دەماینەوە و هەموو خزمەتێك دەکراین. ناڵێم لەم دوایانەدا گۆڕابوو، جاری وابوو بە دوومانگ

ماڵم نابینی لە ناوچەی قادرکەرەم و کۆرمۆر و تازەشار بەردەوام لە واجبدا بووین، چونکە جەیش زوو زوو دەیویست لەوێوە پەلاماری گوندەکان بدات ئەو ناوچانە ڕێگەی هاتنی جەیش بوو، ئێمەش بۆ پارێزگاری لە هەموو ناوچەکە بەردەوام لەوێ بووین.

*** ئێوە وەک هێزی پشتگیری کێ بەرپرستان بوو.؟**

– هێزی پشتگیری هەر گوندێك کرابوینە مەفرەزەیەك و کەسێك لە خۆمان کرابووە بەرپرسمان.

*** مەبەستم ئەوەیە لە ڕووی ڕێنماییەوە، کێ ڕێنمایی دەکردن.؟**

– کادرو بەرپرسەکانی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان لەناوچەکە.

*** کەواتا ئێوە سەر بە هێزەکانی یەکێتیی بوون.؟**

– خۆی ئەوکاتە تەنها یەکێتیی لەناوچەکە بوو، خەڵکەکەیش زۆربەی زۆری جەماوەری یەکێتیی بوون. بەڵام خەڵکمان هەبوو لایەنگری پارتی یان شیوعی بوون و وەك ئێمە هێزی پشتگیری بوون. بەتایبەت لە دوای ساڵی 1986وە کە لایەنەکان ئاشتبوونەوە مەفرەزەی پارتی و شیوعی و حسك پەیدا بوون و بۆ جەولە دەهاتنە ناوچەی گەرمیان، ئیتر ئەوەنە

فەرق ناكرا، ئەمە چیە و چی نیە، هەموومان كورد بووین. كاتێ حكومەت پەلاماری گوندێكی دەدا یان بەتۆپ و تەیارە لێی دەداین نەیدەپرسی ئەمانە سەر بەكوێن، گرنگ ئەوە بوو كوردین و حكومەت بەیەك چاو تەماشای هەموومانی دەكرد.

*** باسی ئەوەتكرد مەفرەزەی لایەنەكانی تریش پەیدابوون، كە ئەوان پێشتر لەگەڵ یەكێتیی لە شەڕی براكوژیدابوون و ئێوەش بەحساب سەر بە هێزەكانی یەكێتیی بوون، مامەڵەی حیزبەكانی تر چۆن بوو لەگەڵ هێزی پشتگیری.؟**

– ئەی نەموت ئەوان دوای ئاشتبوونەوەكە هاتنە ناوچەكە، هیچ كێشەیەكیان لەگەڵمان نەبووە. وە ساڵی 1987 جەیش پەلاماری ئاوایی (جەلال)یدا، كە لە گوندەكەی ئێمەوە بەپێ دوو سەعات رێگە دەبوو، مەفرەزەی یەكێتیی و حیزبی شیوعی و حسك و ئێمەش وەك هێزی پشتگیری پێكەوە حكومەتمان شكاند. هەتا لەبیرمە تەیارەكە دووكەڵێكی سپی بەردایەوە هەموومان ترساین ووتمان ئەوە چەكی كیمیاییە، پێشمەرگەیەكی حیزبی شیوعی عەرەب بوو ناوی (قەیس) بوو، ورەی دەدایە بەرمان كە نەترسین ئەوە كیمیایی نیە ئەوە بۆ رەسەدێتی. وە دوای دوكەڵەكە ئیتر بەتۆپی دورهاوێژ شوێنەكەی تۆپبارانكرد ئەو

پێشمەرگەیە و کوڕێکیش لە حسك شەهید بوو ناوی (عبدولا) بوو. لەو شەڕەدا لە هەموو لایەنەکان شەهید و بریندار هەبوو.

*** لە گوندەکەی خۆتان یان گوندەکانی نزیکتان بارەگای هێزی پێشمەرگەی لێ بوو.؟**

– وەك مەقەڕ نەء بەڵام بە جەولە زوو زوو پیشمەرگە دەهاتن.

*** کەواتا تا ئەنفال گوندەکە و ناوچەکەتان هیچ شەڕ و ناخۆشیەك رووی نەکردۆتە لاتان.؟**

– ئەوەی من باسی دەکەم باسی گوندەکەی خۆمان دەکەم، وەك پەلامار و شەڕ، رووی نەداوە، بەڵام بە نسبەت تۆپ و تەیارەوە قسوریان نەکردووە.

*** لەکوێوە تۆپباران دەکران.؟**

– لەلایەن حکومەتەوە.

*** دەزانم لەلایەن حکومەتەوە، مەبەستم ئەوەیە حکومەت لەچی شوێنێکەوە تۆپی تێدەگرتن.؟**

- له مه‌عه‌سکه‌ره‌کانی نه‌وجول و قادر که‌ره‌م و له له‌یلان و به تۆپی نه‌مساوی له لیواکه‌ی چه‌مچه‌ماڵیشه‌وه، ته‌یاره‌ش ده‌هاته سه‌ر ناوچه‌که و ره‌می ده‌رکرد.

*** ته‌یاره مه‌به‌ستت فڕۆکه‌یه، یان هه‌لیکۆپته‌ر.؟**

- به هه‌لیکۆپته‌ر و به ته‌یاره‌ی هه‌نته‌ر

*** هیچ که‌س به‌هۆی تۆپ و ته‌یاره‌وه زیانی به‌رکه‌وتووه له گونده‌که‌ی ئێوه.؟**

- به‌ڵێ وابزانم ساڵی 1986 بوو ژنێك شه‌هید بووناوی ئاوات بوو ته‌یاره‌ی هه‌نته‌ر لێی دا، ژنه‌که دووگیان بوو کاتی منالبوونی نزیك بوو، مناڵه‌که‌ش له زگیا به‌ر پارچه که‌وت هه‌ردوکیانی کوشت. جارێکی تریش ته‌یاره ره‌میکرد کچێکی کوشت ته‌مه‌نی حه‌وت ساڵان بوو.

ساڵی 1987 جارێکی تر کچێکی عازه‌ب ناوی (نه‌رمین ره‌شید که‌ره‌م)بوو، چوو بوو بۆ سه‌رکانی ئاو بێنێت ده‌به‌ی ئاوه‌که له‌سه‌ر شانی بوو، ته‌یاره دایلێی شه‌هیدی کرد.

*** هاتووچۆی خه‌ڵك بۆ شار چۆن بوو.؟**

- به سەیارە و تەرەکتەر هاتوچۆ دەکرا.

*** مەبەستم هۆکاری گواستنەوەکە نیە، ئەو ناوچانەی ئازاد بوون چۆن لەشارەوە کەلوپەل و خۆراکی پێدەگەیشت، حکومەت ڕێگەی دەدا بچنە شارەکان خۆراک و پێداویستی بهێنن.؟**

- سەرەتا باش بوو، بەڵام یەك دوو ساڵی کۆتای زۆر خراپ بوو، بەزەحمەت شت دەهێنرا. ژن و پیرەمێرەکان دەیانتوانی بچنە شار و بە هیلاکەت و بەڕێگەی قاچاخ و هەندێ جاریش دەبوو بەرتیل بدرایەتە ئەو جەیش و جاشانەی لە رەبیەکانی سەر رێگە و سەیتەرەکان بوون. ئەگینا نەیان دەهێشت هیچ شتێك بگاتە گوندە ئازادەکان.

*** سەرچاوەی زانیاری خەڵکەکە چی بوو، بەچی دەتانزانی رووداوێک لە ناوچەیەکی تر رویداوە، یان جەیش و جاش چوونەتە سەر شوێنێک شەڕ بووە، یان گوندێک سوتاوە.؟**

- وەڵا سەرچاوەی هەموو زانیاریەك هەر رادێۆ و پێشمەرگە بوو، جارجار بەهۆی هاتوچۆی خەڵکیشەوە لە دێیەك بۆ دێیەکی تر دەماو دەم شتمان دەبیست.

*** مەبەستت چیە لە رادیۆ و پێشمەرگە.؟**

– ئەوکاتە تەنها رادیۆی گەلی کوردستان کە هی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان بووە بووبووە سەرچاوەی هەموو هەواڵ و دەنگ و باسێك لای خەڵك. پێشمەرگەش بەهۆی جیهازەوە هەمووشتێکیان پێدەگەیشت و بەهۆی جەولەکردنیشەوە کە زوو زوو جەولەیان دەکرد و دەچوونە ناوچەکانی تر و دەگەڕانەوە خەبەر و دەنگ و باسیان بۆ دەهێنایین.

*** ئەی ترسی ئەوەتان نەبوو رەنگە هەم رادیۆکە و هەم پێشمەرگەش هەموو هەواڵ و راستیەکتان پێ نەڵێن تا نەترسن و ناوچەکە جێنەهێڵن.؟**

– جا با بترسایاین، ناوچەکەمان بۆکوێ جێدەهێشت، ئەوەی ئێمە لێی دەترساین تەنها حکومەت بوو خۆ نەماندەوێرا بچینەوە بۆلای حکومەت، ئەوەی لە شارەکانیش و لە گوندە نزیکەو شار و جادەکانیش دەترسا دەهاتنە ناوچەکانی ئێمە کە لە حکومەتەوە دوور بوو ئیتر ئێمە بۆ کوێی تر بچین. ناوەڵا ئەو رادیۆیە بیوتایا ماست رەشە، باوەڕمان پێی دەکرد.

*** ئەی چی کاتێک ئیتر تەواو هەستتان بە مەترسی کرد بۆ سەر ناوچەکەتان.؟**

– له راستیا بەردەوام هەستمان بە مەترسی دەکرد لەسەر ژیانی خۆمان و ماڵ و منالّمان، تۆ لە ناخافڵ کاتێکت دەزانیّ تۆپباران دەستپێدەکرد، یان کۆپتەر و تەیارە دەستی دەکرد بە رەمیکردن، ئەمانە هەمووی مەترسی بوون. بەڵام کە شەڕی سەرکردایەتی یەکێتیی دەستپێکرد و حکومەت پەلاماری ئەو ناوچانەیدا کە سەرکردایەتی شۆڕشی لیّ بوو، وە پێشمەرگەی هەموو ناوچەکان بانگکران بۆ سەرکردایەتی و رۆژانە لە رادیۆکەوە گوێمان لیّ دەبوو ئەوە فلاّنە ناوچە بۆردومانکرا و فلاّنە گوند سوتا و خەڵك ئاوارەو دەربەدەر بوون و ئەوەنە هاوڵاتی لەلایەن سوپاوە دەستگیرکرا و بە کیمیایی لە هاوڵاتیانی داوە، ئیتر تەواو هەستمان بە مەترسیکرد کە ئەمجارە حکومەت نیازی وایە بەیەکجاری هەموو کوردستان وێران بکات و هەموو میللەتەکە لەناو بەرێت.

*** ئەو ماوانەی کە ئێوە دەچوون بۆ جەولە یان بۆ شەڕی بەرگری، ژن و منالّەکانتان لەکویّ بوون.؟**

– هەر لە گوندەکەی خۆمان. لەگەڵ ماڵی باوکم پێکەوە بووین.

*** جگە لە ئێوە، خەڵکی ناوچەکەش هەستیان بەو مەترسیانە کردبوو.؟**

– بەڵێ، شتەکە شاراوە نەبوو. خەڵك زۆر دەترسا، چونکە پێشتر هەندێ لە گوندەکانی نزیك شار و جادەکان روخێنرابوون و خەڵکەکەی برابوون لە ئۆردوگا لە شارەکان نیشتەجێکرابوون. هەموو ترسی ئەوەمان هەبوو ئێمەش بەو دەردە بچین، ئەمانووت رەنگە ئێمە خراپتریشمان بەسەر بێت و رەنگە کیمیایی بکەنە سەرماندا چونکە سەدام ناوی ناوچەکانی ئێمەی نابوو (ناوچەی موحەرەمە) تەنانەت مەڕو مالاتیشیان بدیایا کۆپتەر رەمی لێی دەکرد، چەندین شوان کۆپتەر کوشتی، سەیارە لە دێیەکەوە بچوایا بۆ دێیەکی تر دەدرایە بەر تۆپ. خەڵکەکە لە ترسا شەوان بە تەرەکتەر و بێ لایت بە تاریکی هاتووچۆیان دەکرد، چونکە لە هەرشوێنێ لایتێ دەرکەوتایا هەموو ئەو ناوچەیە دەدرایە بەر تۆپ.

*** باشە کە مەترسیەکە ئەوەندە زۆر بوو، بیرتان لەوە نەدەکردەوە بەدوای چارەسەردا بگەڕێن.؟**

– هیچ چارەیەك نەبوو، ئەم کوردە هەروا هاتبوو، هەرچی حکومەتێ هاتبێ هەر بۆ گیان کورد بوو بووە بەلا. لە باوباپیرانمانەوە هەر راکە ڕاك

و کۆڵ بەکۆڵ بووین لە ترسی پەلاماری سوپا. ئیتر جاری وابوو چەندین ساڵ دەکەویتینە ئارامیەوە و جاری واش بووە بەردەوام لەژێر تۆپ و تەیارەیا ژیاوین، چارەسەر تەنها بەدەست خوا و سەدام بوو، یان ئەوەبوو خوا فەوتی بکردایا، یان دەبوو سەدام دەستی لەو زووڵمە هەڵگرێت، ئێمە چیمان پێدەکرا تا بەدوای چارەسەردا بگەڕێین.

*** ئەی بە پێشمەرگە و بەرپرسەکانیانتان ناوت، کە رۆژ لە دوای رۆژ مەترسیەکان زیاد دەکەن، پلان و بەرنامەیان چیە بۆ پاراستنی ئەم خەڵکە.؟**

– وەڵا پرسیارمان ناکرد چونکە ئەوانیش وەك ئێمە لەناو وەزعەکەیا بوون. خۆی لە راستیا باوەڕمان وابوو حکومەت دەرەقەتی پێشمەرگە نایات و پێشمەرگە و خۆمان دەتوانین ناوچەکە بپارێزین، لەشەڕ ناترساین، بەڵام دووره تۆپ و تەیارەکە مەترسی بوو، بەم دووا دووایەش ئەم کیمیاییە خەڵکەکەی تۆقاندبوو. پێشمەرگە و کادیرەکانیش زۆرجار کۆبونەوەیان بە ئاواییەکان دەکرد و دڵی خەڵکیان دەدایەوە کە ورەتان بەرز بێت و ئێمە مقاوەمەت دەکەین و بەجێتان ناهێڵین، رێنمایی خەڵکەکەشیان دەکرد (کوونە تەیارە) دروستکەن تا لە کیمیایی و تۆپ و تەیارە رزگارتان بێت.

* ئەی کاتێ ناوچەکە هەمووی پەلامار دراو نەتوانرا بەرگری بکرێت، ئەوکات چیتان دەوت.؟

– نەزانی من ئێستایش دەڵێم ئەگەر حکومەت پیلانەکەی بەو جۆرە وا لێنەکردایا کە یەکەمجار پەلاماری سەرکردایەتیدا، ئەگەرنا ئەوە با هەر جەیش و جاشی بهێنایەتە ناوچەکە نەیئەتوانی سەرکەوێت، بەڵام ئەو لەپێشا بە (گرتنی سەرکردایەتی و بە چەکی کیمیایی) ورەی پێشمەرگە و خەڵکەکەی رووخاند ئەوجا پەلاماری داین.

* ئا، پێت وایە لەبەر ئەوەی پەلاماری سەرکردایەتیدا، وورەی خەڵک و پێشمەرگە رووخا.؟

– نا، مەبەستم ئەوە نیە بڵێم هەر لەبەر ئەوەی پەلاماری ئەوێی دا ئیتر وورە نەما. لەبەر ئەوەبوو کە پەلاماری سەرکردایەتی دا، هەرچی پێشمەرگە هەبوو هەمویان برد بۆ ئەو ژویرە، ماوەیە زۆر بەردەوام لە شەڕدابوون، هەموو هیلاك و ماندوو کۆمەڵێ شەهید و بریندار زۆریان دابوو، فیشەك و خواردنیان نەمابوو، لە شەڕەکەشدا شکستیان خواردبوو بەو هیلاکی و وەزعەوە کە هاتنەوە ناوچەکە نە خۆیان وورەیان مابوو نە خەڵکیش کە ئەو وەزعەی بینی وورەی ما. ئەوان باسی قورسی شەڕەکە

و وێرانی ناوچەکەیان کرد، ئەوەیان ووت کە خەڵك هەڵەبجە بەکیمیایی لێی دراوە و شارەکە هەمووی ئیبادە بووە، ئیتر وورە لە کوێ بمێنێ. بۆیە وتم حکومەت لەوەیا سەرکەوتوبوو کە سەرکردایەتی گرت و پێشمەرگەکەش بە هیلاکی و بێ ئومێدییەوە گەڕایەوە ناوچەکانی ئێمە، کە خواخوایان بوو شەڕ روو نەکاتە ئەم ناوچەیە تا پشوویەك بدەن و هۆشێك بێتەوە بەریان ئیتر لەکوێ بتوانن وەك جاران بەر بە جەیش بگرن، بەڵام بەهۆی ئەوەی جگە لە یەکێتیی مەفرەزەی حیزبەکانی تریشی لێبوو، ئومێدێکمان دەدایەوە بەر خۆمان و ئەمانووت هەرچۆنێ بێت دەمانپارێزن.

***  ئێوە دەتانزانی ئەو پەلامارە سەربازییە ئەوە پرۆسەی ئەنفالە و هەموو خەڵکەکە بەو دمردە دەبات کە توشی بوون.؟**

–  ناوەڵا، کورە بەخوا وابزانم چەند مانگێ یان نزیك ساڵێ دوای ئەوەی لە بیابانەکانی نزیك (رومادی) گوللەباران کراین کە من هاتبوومەوە ئەوجا لەناو خەڵکدا بیستم پێمانیان وتووە ئەنفال.

***  باشە دوای ئەوەی سەرکردایەتی یەکێتیی گیرا، ئیتر پەلاماری ناوچەکەی ئێوە درا.؟**

– نەخێر، دوای سەرکردایەتی و کیمیابارانکردنی هەڵەبجە، پەلاماری ناوچەی قەرەداخ درا، حکومەت ئەمجارە لە پێشا چوو ئەوسەری لە خەڵکەکە گرت و لەوێوە بەرەو گەرمیان گەڕایەوە، کە دیووی قەراخ بەرەو گەرمیان گیرا، ئیتر وورده وورده بەرچاومان روونتر بوو لەوەی ناتوانین دەربازبین. بۆیە خێزان و پیرو پەککەوتەمان نارده ئەو هەرده و هەڵەتانە تا خۆیان بشارنەوە لەژێر کەلۆز و ئەشکەوت و بن تاشەرد و لەناو ئەو چەم و شیوانەی هەبوون، بەڵکوو ئەمە خوایە جەیشەکە بەسەر ناوچەکە تێپەڕێت و ئەو پەڕی خانووی لادێکان دەسوتێنێ و خەڵکەکەی رزگارمان، دەبێت وەك چۆن چەندین جاری تر لادێکانی کوردستان سوتان و دواتر دروستمان کردوونەتەوە.

*** ئێوە بەدیاریکراوی کەی خێزان و کەسوکارتان لە ئاوایی دەرکرد.؟**

– وەڵا رۆژ و مانگەکەی نازانم.

*** نەورۆزتان تێپەڕاندبوو.؟**

– کووره ئائا، هەفتەیە بۆ دە رۆژ دەبوو نەرۆزمان کردبوو.

*** ئەوکاتەی گوندەکانتان چۆڵکرد و چوونە چەم و هەردەو کەلۆزەکان، پەلاماری سەربازی بۆ ناوچەکەتان دەستی پێکردبوو.؟**

- ئێمە گوندەکانمان چۆڵ نەکردبوو. !

*** ئەی نالێی چووبوینە هەردەو هەڵەتەکان.؟**

- تەنها ژن و منالٚ و پیرەمێردەکان چووبوون، زەلامەکان لە ئاوایی مابووینەوە. ئەمانووت ئەوەنەی بتوانین بەرگری دەکەین و ئەگەر نەشتوانین زەلام دەتوانێ خۆی رزگار بکات، بۆیە مابوینەوە.

*** بە قەناعەتەوە باوەڕتان بەخۆتان هەبوو بتوانن بەرگری بکەن.؟**

- وەڵا قەناعەت چیە، باوەڕ ناکەم کەس هەبووبێت حەزی بەوە بووبێت جەیش و جاش پەلامارت بدات، بەڵام کە هیچ رێگەیەکی تر شك نەبەیت ناچاری بیر لەوە بکەیتەوە دیفاع لەخۆت بکەیت. ئەگەر رێگایەکی ئاسانترمان شك ببردایا بەدڵنیایەوە ئەوەمان دەگرتە بەر. ئێمە دڵنیابووین حکومەت دێتە سەرمان، رێگەی ئەوەشت نەبوو روو بکەیتە شارەکان، ئیتر ناچار بووین چی بکەین.

*** کەواتا بەرلەوەی پەلاماری سەربازی بۆ سەر ناوچەکەتان دەستپێبکات حکومەت هەموو ئەو ڕێگانەی گرتبوو کە خەڵک دەیتوانی خۆی لێوە بگەیەنێتە شارەکان.؟**

– حکومەت دەمێك بوو ڕێگە سەرەکیەکانی گرتبوو، ئەگەر پێشمەرگە ڕێگەیان بدایا خەڵك بە قاچاخ و توولەڕێ زۆر بوو خەڵك بەرەو شارەکان بڕوات، بەلاّم پێشمەرگەیش نەیهێشت.

*** بۆ نەیاندەهێشت، لەکاتێکدا خۆت دەڵێی کە لە شەڕی سەرکردایەتی گەڕانەوە باسیان دەکرد خەڵکەکە چی بەسەر هاتووە. ئیتر بۆ ڕێگربوون لەوەی ژن و منالّ رزگاری بێت.؟**

– وەلاّ من نازانم بەدیاریکراوی بۆ نەیان ئەهێشت ئایا بڕیار بوو یان خۆیان ڕێگربوون. بەلاّم بە خەڵکەکەیان دەووت ئێمە بەرگریتان لێدەکەین و پێویست ناکات خۆتان بخەنە مەترسی ئەو ڕێگایانەوە بە قاچاخ بەرەو شارەکان بڕۆن. کەس دڵنیا نیە لەوەی لەوێش چیتان بەسەر دێت.

*** ئێ کەواتا ئەوان لە پەرۆشی ئەوەیان بووە خەڵکەکە تیا نەچێت و سەربەخۆ بڕیارێك نەدات کە ئەنجامەکەی نازانی؟**

- ئاخر خۆ خەڵك لەخۆیەوە ناچوو، یان كەسوكاری لەشارەكان دەستڕۆ بوون و لە پەنای حكومەت بوون، بەو هیوایەوە كە ئەوان بیان پارێزن، یان بەدەم عافواتەوە دەیانویست بڕۆن.

*** ئێ كوا هیچ بڕیارێك هەبوو تا وەك لەعافواتدا درابێت بۆتان و خەڵك بە پیرییەوە چوبێت و پێشمەرگە نەهێڵێت.؟**

- دیعایە هەبوو دەیانووت حكومەت عافواتی داوە و هەركەس خۆی بڕواتەوە دەستگیری ناكات.

*** هیچ كەس هەبوو بڕوا بەم دیعایەیە بكات و بیەوێ بڕوات بەڵام پێشمەرگە ڕێی لێگرتبێت.؟**

- بەڵێ، لە ناوچەی (داوێ) خەڵكێ زۆر كە زۆربەی ژن و منداڵ بوون ویستبوویان بچن بەرەو (دوزخورماتو) بەڵام پێشمەرگە پێشی پێگرتن و نەیهێشت بڕۆن و بەخەڵكەكەیان ووتبوو درۆیە هیچ عافواتێك نیە ئەگەر بڕۆن هەمووتان تیا ئەچن، نەیانهێشت خەڵكەكە بڕۆن و دواتریش هەمووی ئەنفال كران.

*** که هێرش و پەلامار بۆ سەر ناوچەکەتان دەستپێکرد، خەڵك چی کرد، مقاومە کرا، کە دەڵێی جگە لە یەکێتیی مەفرەزەی حیزبی شیوعیی و پارتی و سۆسیالیستیشی لێ بوو.؟**

– خەڵك هەمووی سەرگەردان بوو، چونکە پێشتر بەشی زۆری چووبونە هەردە و هەڵەتەکان و گەنجەکان لە ئاواییەکان مابوونەوە، هەبوو هەر ئیتر لەو جیابوونەوەیەوە چاویان بەیەکتر نەکەوتەوە، بەشێکی زۆریش گەیشتنەوەیەك و دواتر ئەنفال کران. حکومەت لەیەك کاتا لە چەند لایەکەوە دەستیکرد بە پەلامار، لەهەموو قۆڵەکانیشەوە وەك ئەوەی ئاگر بەسەر ناوچەکەدا ببارێنێ بۆردومانی پێش خۆی دەکرد، وەك رۆژی حەشر وابوو. یەکەمجار پێشمەرگە خۆی ئامادە کرد لە گوندی (تازەشار) بەرگری گەورە بکات و نەهێڵێ حکومەت ئەو سەنگەرە بشکێنێ، چونکە دەبوو لەوێوە بێن بۆ سەر گوندەکانی تر. رۆژێك مقاوەمەی باش کرا و جەیشەکەیان دواخست لەو قۆڵەوە، لە سەعات حەوتی بەیانیەوە شەڕ دەستیپێکرد تا چواری ئێوارە، بەڵام دوای چەند سەعاتێ شەڕکردن بە چەکی کیمیایی لە (تازەشار) درا، ئەوەی لەوێ بوو بۆ بەرگریکردن هەمویان شەهید بوون وابزانم یەك پێشمەرگە رزگاری بوو ناوی (کەمال) بوو خەڵکی دوزخورماتو بوو، زۆربەیان پێشمەرگەی یەکێتیی و حیزبی

شیوعی بوون. ئیتر خەڵك و پێشمەرگە وورەیان بەردا. کە لەو قوڵەشەوە حکومەت سەرکەوت ئیتر لە هەموو لایەکەوە کەوتە پێشڕەوی لە سەرقەڵا و لە سەنگاو لە لەیلان و قادرکەرەم و لە دوزو کفری و لە ئاسمانیشەوە دەیان هەلیکۆپتەر دەهاتن و دەچوون و هیچ رێگا و ئومێدێك نەما، هەموو لە ترسا ئەژنۆمان شکا و بەچۆکدا هاتین.

*** تۆ ئەوکاتەی باسی دەکەیت لەکوێ بوویت.؟**

– من لە ئاواییەکەی خۆمان بووم (کانی قادر).

*** ئەی خێزان و کەسوکارت.؟**

– ئەوان دە رۆژێك پێشتر لە ئاوایی دەریانمان کردبوو بردبویانمان بۆ نزیك هەردەیەك لە (ئەولا هۆری) هەر لە نزیك گوندەکەی خۆمان.

*** هەر خێزان و کەسوکاری ئێوەی لێبوو، مەبەستم لە خەڵکی گوندەکەی خۆتانە.؟**

– نەوەڵا، ژن و منالّ 14 پازدە دێ لەوێ خۆیان پەنا دابوو.

*** ئێوە لەو دە رۆژە هیچ جارێك چوون بۆ لای کەسوکارتان.؟**

- بەڵێ.

*** جگە لە ژن و منداڵەکان، خەڵکی تری وەک ئێوە واتا گەنجەکان لە گوندەکانی ترەوە هاتبوون بۆ ئەو شوێنەی خێزانەکانی لێ بوو.؟**

- بەڵێ خەڵکێکی زۆر هاتبوون.

*** چەکیان پێ بوو.؟**

- ئێمە.؟

*** دەزانم تۆ پێشتر ووتت چەکت پێبوو، مەبەستم ئەو خەڵکەی ترە.؟**

- بەڵێ زۆری چەکی پێبوو.

*** ئەی دوای ئەوەی (تازەشار) وەک سەنگەری بەرگری ناوچەکە کۆتایی هات و ئەوە ئێوە چوونەوە لای کەس و کارتان، بڕیاری چیتاندا.؟**

– هەر ئەو رۆژەی (تازەشار) کۆنترۆڵکرا کە سەعات چواری ئێوارەبوو، بۆ بەیانی لە هەموو قۆڵەکانەوە پەلاماردانەکان دەستپێکردەوە بێ هیچ بەرگریەك و هەموو گوندەکان سوتێنران و لەگەڵ زەوی تەختکران. خەڵکەکەی وەك پێشتر باسم کرد لە ترسا roوویان کردبووە هەردەو هەڵەتەکان، بەڵام ئەویش هیچ سودی نەبوو چونکە دەیان هەلیکۆپتەر بە ئاسمانی ناوچەکەدا زۆر بەنزمی دەسوڕانەوە و هەموو ئەو شوێنانەیان لێوە دیاربوو کە پێشتر ئێمە وەك پەناگا ئومێدمان پێی بوو.

لە هەموو لایەکەوە هەروا دووکەڵ بوو دەچوو بە ئاسمانا، ئاگریان نابووە خانوو ماڵەکانەوە. تالآنی دەستپێکرد و هەروا جەیش و جاش بوو کەوتنە بردنی کەلو پەل و ماڵەکانمان، مەڕوماڵات دەخرایە ناو تەرەکتەر و ئیڤای سەربازی و سەیارەی جاشەوە و بەتاڵان دەبرا. ئێمە هەمو ئەوانەمان بەچاوی خۆمان بینی، دەمانووت خوا دەکات خۆمان رزگارمان دەبێت لەجێی ماڵ دەبێتەوە. چەندینجاری تر بەو جۆرە تالآن کرابووین و بەوە شوکر بووین. خەڵك شپرزە بووبون کەس نەیئەزانی چیمان بەسەردێت و کەس عەقڵی لەکەس زیاتر بە وەزعەکەدا ناشکا تا بەقسەی بکەیت و بڕیار بدەیت چی دەکەی، دەتووت رۆژی حەشرە، هەر چەم و دۆڵێك سەدان خێزان و هەریەکی هەندێ نان و ئاوی پێیەو دێن و دەچن بێ ئەوەی بزانن چی دەکەن. مناڵ و ژنەکان لە ترسی زرمەی تۆپ

و گورەی کۆپتەر و چرە دوکەڵی گوندەکان قیژوقاویان دەگەیشتە ئاسمان و کەشکەلانی فەلەك، رۆژە رەشێ بوو هەر مەپرسە.

یەکێ بەرەو خوار دەچوو یەکێ بەرەو ژوور، هیچ رێگایەك نەمابوو رووی تێبکەیت، هەموو سەرمان لێشێوابوو. لە (قادرکەرەم)ەوە خەڵك دەهات بە دوای کەسوکاریا دەگەڕا دەیانووت حکومەت کەس ناگرێت و بەرەو قادرکەرەم برۆن. یەکێکی ترت توش دەبوو دەیووت خۆتان بگەیەننە (لەیلان) یان (دوزخورماتو) خەڵکەکە ئەوەندە نائومێد بووین بە بچوکترین قسە باوەڕمان دەکرد، بێ ئەوەی بزانین هەر بەڕاستی حکومەت دەنگ لەگەڵ کەس ناکات.؟ ئەی ئەگەر بۆ گرتنی ئەو خەڵکە نەهاتووە ئەو هەموو جەیش و دەبابە و تۆپ و تەیارەیە چیە هێناویتیە ناوچەکە. دوایی تێگەیشتین لەوەی حکومەت وەك بازنەیەك بەجۆرێك دەوری ناوچەکەی گرتووە کە کەس نەتوانێ رزگاری بێت و بۆ هەر لایەك بچیت هەر لەناو ئەو بازنەیەدا دەسوڕایتەوە، لەبەر ئەوە راست بوو کە لێگەڕابوو خەڵکەکە خۆی بچێتە بەردەستی سوپا و لە چەند شوێنێکدا کۆمانبکاتەوە تا ئامادەی گواستنەوەبین بۆ ئەو شوێنانەی خۆیان ئامادەیان کردبوو.

ئێمە بڕیارماندا بەرەو مەرکەزی ناحیەکە (قادرکەرەم) برۆین، لە رێگەی چوونمان بەرەو قادرکەرەم زۆر کەسمان توش بوو کە لە قادرکەرەمەوە بە دوای خزم و کەسوکاریاندا هاتبوون، دەیانووت لە مزگەوتەکانی قادرکەرەمەوە بە سەماعە بانگەوازی کردووە هەرکەس

خۆی بێتەوە و تەسلیم بێت حکومەت هیچی لێناکات و ئەوەی لە دەشتەکە بمێنێتەوە کۆپتەر دەیکوژێت. بۆیە ئەوەی خزمێ کەسێکی لە دێهاتەکان و هەردەو هەڵەتەکە بوو بەپەلە هاتبوو بەشوێنیا، دەیانووت هەموو خەڵکەکە دەبەن بۆ شار و حکومەت لە موجەمەع خانویان بۆ دەکات و لە دایرەکان داتان دەمەزرێنێ، جۆرەها پڕوپاگەندەیان لەناو خەڵکە دەربەدەرەکەیا بڵاو کردبۆوە کاری کردبووە سەر گشت ئەو خەڵکە و هەرکەسە و بەپێی خۆی بۆ ناو سوپاکە ملی دەنا.

خەڵکیش هەبوو دەمان ووت تەسلیم نابین هەرچیمان بەسەر بێت لەم دەشت و دەرە باشترە لەوەی بچین تەسلیم بین و کەس نەزانێ توشی چی دەبین. ئێمە هەندێ لەگەنجەکان ئەوەمان پێباشبوو کە ژن و منداڵەکان بەرینە نزیك (قادرکەرەم) ئەوان بچنە شارەوە و خۆمان بگەڕێنەوە لە دەشت و هەڵەتەکان بمێنینەوە تا بزانین خوا دەرویەکمان لێبکاتەوە. وامانکرد شەو خێزانەکانمان برد بۆ نزیکی قادرکەرەم و خۆمان گەڕاینەوە بۆ هەڵەتەکە. زۆر ناخۆش بوو لە ژن و منداڵەکان دابڕاین و هیچ ئومێدێکمان نەبوو کە یەکتر دەبینینەوە یان نا، ئیتر ئەوانەی لەیەك دائەبڕاین باوەشمان کردبوو بەیەکداو بە گریان خواحافیزیمان لەیەك دەکرد، هەرکەسە گەردن ئازایی لەگەڵ ئەوانی تر دەکرد، دەتووت رۆژی حەشرە. ئێستاش ئەو دیمەنانەم لەبەرچاوە کە چۆن بە ئازارەوە لە خێزانەکەم و منداڵەکانم جیا دەبوومەوە، چۆن دایکم و خوشکەکانم و ئەو خزمانە لەیەك دائەبڕاین. ئەوانمان دەنارد بۆ ژێر

چەپۆکی زاڵم و بە هیوابووین بەڵکوو ئەمە خوایە بۆ ئەوان ئەمە ڕێگای دەربازبوون بێت، خۆشمان دەمانویست لەو هەردەو هەڵەتانە خۆمان حەشار بدەین و لە تۆپو تەیارە و جەیش و جاش دەربازبین.

من و عاسی زاوام و لوقمان هەر خەڵکی (کانی قادر) بوو کوڕێکی تر ناوی (محمد) بوو خەڵکی (لەك) بوو، خێزانەکانمان بەرەو قادرکەرەم بەڕێکرد و خۆمان گەڕاینەوە بۆ هەڵەتەکە.

*** خێزان و منداڵەکانتان بە کێدا نارد بۆ قادرکەرەم، لەکاتێکدا دەتانزانی بۆ ناو ئەو سوپایە دەچن کە بۆ گرتنتان هاتووە.؟**

– هەر خێزانەکەی ئێمە نەبوو، سەدان خێزان دەبوون و پیرەمێرد و هەندێ گەنجیش کە بڕیاری دابوو تەسلیم بێت هەموویان پێکەوە بوون کە زۆربەی خزم و کەسوکاری خۆمان بوونن بە پشتیوانی خوا و سەربەخۆ بەرەو قادرکەرەم ڕێگەیان گرتەبەر.

*** شوێنێک هەبوو لە قادرکەرەم تا ئەگەر ئەو قسانە ڕاست بوون کە حکومەت دەستگیریان ناکات، بچنە ئەوێ.؟**

– بەڵێ، خەڵکی گوندەکان هەمووی بەشی ئەوە ناسیار و خزمی لە (قادرکەرەم) هەبوو تا لە لێقەومانێکی ئاوایا ڕووبکاتە ماڵەکەی. ئێمەش

خزم و کەسمان لەوێ زۆر بوو، ماڵ باوکی خێزانەکەم (دووبنە بوون) ماڵێکیان لە کەرکوك بوو ماڵێکیان لە قادرکەرەم، ئەمان بە هیوای ئەوەوە چوون ئەگەر خوابکات دەستگیر نەکرێن بچنە ماڵ ئەوان و لەوێوە بگەنە کەرکوك.

*** کاتێ ئەوانتان بەرەو ناو سوپا بەڕێکرد، خۆتان بۆ کوێ گەڕانەوە.؟**

– وتمان دەچینە ئەو هەردەو هەڵەتانە خۆمان حەشار بدەین تا دەروویەك دەدۆزینەوە.

*** تۆ باستکرد کە بەهۆی ئەوەی هەلیکۆپتەر بە نزمی و بەردەوام بە ئاسمانەوە بوو، بواری ئەوەشتان نەما لە هەردەو چەمەکان بن، ئیتر بەچی هیوایەکەوە جارێکیتر گەڕانەوە بەردەستی کۆپتەرەکان.؟**

– راست ئەکەی وام ووت، بەڵام ئەگەر ئەو هەموو ژن و منالەت لەگەڵ نەبێ ئێمە هەر چەند زەلامێك بین دەمانتوانی خۆمان حەشاردەین. ناوچەکە بەشی ئەوە ئەشکەوت و بن کەلۆز و شتی تیابوو خۆمان بشارینەوە، بەتایبەت کە پێشتر لە زۆر ناوچەی نزیك گوندەکان (کونە

تەیارە) دروستکرابوو تا خۆتی تیا بشاریتەوە. خۆ ئێمەش بە نیاز نەبووین بەردەوام هەر لەو دەشت و دەرە بین، ووتمان ئەوەندە خۆمان حەشاردەین تا بزانین حکومەت نیازی چیە و بەڵکوو یان خۆمان بتوانین خۆمان لە ناوچەکە رزگارکەین یان بەڵکوو خزم و کەسوکارمان بتوانن لە شارەوە شتێکمان بۆ بکەن، کێ دەیزانی وەزعەکە بەوجۆرەیە کە روویدا.

*** یەکەم شەوی لێکدابڕانتان لەگەڵ خێزان و کەسوکار، ئێوە بۆ کوێ چوون و چەند کەس دەبوون.؟**

– وەڵا زۆربووین من و حبیب برام و عاسی و لوقمان و محمد و کۆمەڵێ گەنجی تر لە خەڵك ئاوایی و گوندەکانی تریش، کاتێ گەڕاینەوە بەرەو هەڵەتەکە خەڵکی تریشمان زۆر توش دەبوو، هەبوون بەرەو قادرکەرەم و هەبوون وەك ئێمە خێزانەکانیان ناردبوو خۆیان بۆ شوێنێ دەگەڕان تا رزگاریان بێت. پێشمەرگەشمان زۆر دەبینی کە سەرگەردان بووبوون هەیان بوو لە مەفرەزەکەی دابڕابوو، هەبوو بەرەو قادرکەرەم دەڕۆیشت و خۆی تەسلیم دەرکدەوە، هەبوو تێکەڵ خەڵکانی وەك ئێمە بوبوون و بە هیوای رزگاربوون بەناوچەکەدا دەگەڕان.

*** بڕیارتاندا بۆ شوێنێکی دیاریکراو بچن.؟**

- ئەو شەوە بەرەو بناری گل چووین، تا ئەگەر بمانتوانیایا لەوێوە بەرەو دوزخورماتوو یان لەیلان یان بەرەو کفری خۆمان رزگاربکەین، بەڵام تەماشامانکرد هەمووی گیراوە. ئەوشەوە نەخەوتین و بە ئومێدی دۆزینەوەی رێگایەکەوە هەر تەماشای ناوچەکەمان دەکرد، بەڵام لەهەموو لایەکەوە ئاگر دیاربوو گوندەکان دەسوتان، بۆ بەیانی کاتێ رۆژ بووەوە بە دووربین تەماشامان دەکرد هەموو ناوچەکە جەیش بوو هەر بە مەعەسکەرێ گەورە دەچوو.

چەندین کۆمەڵ خەڵکمان دەبینی لە چەم و شیوودۆڵەکانەوە بەرەو قادرکەرەم دەچوون و خۆیان تەسلیم دەکردەوە، دەیانووت پێشمەرگەکان پێمانیان ووتووە بچن خۆتان تەسلیم بکەنەوە ئیتر بەرگریمان پێناکرێت.

*** ئەی کاتێ دەتانبینی هەموو ناوچەکە گیراوە و وەک خۆت وتت بووبووە مەعەسکەرێکی گەورە، پێشمەرگەش توانای بەرگری نەمابوو، وا دەتانبینی خەڵکەکەش هەمووی هەر بەرەو ژێردەستی سوپا دەچێت، بەنیاز بوون تاکەی بەو جۆرە بمێننەوە و تەسلیم نەبن.؟**

– وەك پێشتر ووتم ئەو خەڵكە هەمووی سەری لێشێوابوو نەیدەزانی چی بكات، ئێمەش هەروەك ئەو خەڵكە سەرگەردان بووبووین، ئەمانووت خۆمان تەسلیم ناكەین با لێرە بمانكوژن باشترە لەوەی تەسلیم بین و نەزانین چیمان بەسەر دێت. لەپڕ یەكێكمان توش دەبوو لە شارەوە هاتبوو بەشوێن كەسوكاریا دەگەڕاو دەیووت جارێ حكومەت كەسی نەگرتووە و ئەوەی دەڕوات بەرەو قادركەرەم تەنها ناوی دەنوسرێت و لە (چەم ئالیاوا) كۆدەكرێتەوە. ئیتر جارێ دەمانووت با ئێمەش بچین تەسلیم بینەوە و وەك ئەو خەڵكە چیمان بەسەر دێت لەگەڵ میللەتەكەی خۆتا بیت هەرچیەك بێت وەك ئەوان، جارێ دەمانووت بەخوا بۆیە كەس ناگرێت دەیەوێ هەموو خەڵكەكە كۆبكاتەوە و دواتر بەشێنەیی دەیگوێزێتەوە بۆ سجن، چونكە ئەو تەوقی هەموو ناوچەكەی كردبوو، با كەس نەگرێت تا دەگەیتە قادركەرەم ئەی دوای ئەوە بۆ كوێ دەچیت، دەكەوینە ناو تۆڕەكەیەوە. لەبەرئەوە نەمان ئەتوانی هیچ بڕیارێ بدەین. كۆمەڵێ خەڵكی ترمان توش دەبوو دەیانووت كورە بابە تەسلیم بوونەوەی چی، حكومەت لەهەموو ئەو ناوچانەی شارباژێڕ و قەراخیش وایكردووە خەڵكەكەی كۆكردۆتەوە و دوای ژن و مناڵ و پیرو پەككەوتە هەمووی خستۆتە سەیارەوە و كەس نازانێ بۆ كوێی بردوون، ئیتر

دەگەیشتینەوە قەناعەت کە خۆمان تەسلیم نەکەین و چی دەبێت با ببێت.

***   چەند رۆژ بەوجۆرە مانەوە.؟**

– وەڵا تەقریبەن هەفتەیەك.

***   نان و ئاوی ئەو هەفتەیەتان لەکوێ دابین کرد.؟**

– هەر ئەوکاتەی ژن و مناڵ و خێزانەکانمان برد بەرەو قادرکەرەم هەریەکی تورەکەیەك نانمان لەگەڵ خۆمان هێشتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی دە دوانزە رۆژێك لەوەوبەر هەموو خەڵکی گوندەکان چووبوونە چەم و هەردە و کەڵوەزەکان، دواتریش کە چووبوون تەسلیم ببنەوە خۆراك و کەلوپەلێکی زۆر لەو هەردەو هەڵەتانە بوو ئەگەر ترسی جەیشەکە نەبوایا و بمانتوانیایا بمێنینەوە بەشی چەند مانگێ خواردنمان دەست دەکەوت.

***   ئەو هەفتەیەی بەو جۆرە مانەوە، هیچ زانیاریەکتان لەسەر خێزان و کەسوکارەکانتان هەبوو چیان بەسەر هات.؟**

– ئەی نەمووت ئەوانمان رەوانەی قادرکەرەم کرد. !

*** بەڵێ وات ووت، بەڵام دەستگیرکران، رزگاریان بوو، لەئاانزانی چیان بەسەرهات.؟**

– نا، ناوەڵا ئاگامان لێیان نەما.

*** ئەی خەمی ئەوەتان نەبوو سوپا دەستگیری کردبن.؟**

– چۆن خەممان نەبوو، بەخوا هەر سەعاتێکم بە شەو و رۆژێك لی دەڕۆیی، قاژەی جەرگم دەهات بۆ مناڵەکانم، هەروا بەدەم ئاسانە بیگێڕیتەوە کوڕت هەبێ و ژن و منالی بەرمەمکەت لێت دابڕابێ و کەوتبێتنە بەردەستی دوژمن، هەروا ئاسان نەبوو، بەڵام خۆشمان ئەوەنە وەزعمان خراپ بوو نەمان دەتوانی بکەوینە هۆڵی ئەوانەوە، ئەگینا بەخوا ئەو شەوەی لە نزیك قادرکەرەم لێك دابڕاین کاتێ ماچیانمکرد و ئەوان رۆیشتن وام ئەزانی بەزیندوێتی پێستەکەم لەلەشم ئەکەنەوە ئەوەنە ئازاری هەبوو، بەڵام دەسەڵات چی بوو هەر دەبوو خۆمان بخۆینەوە و نەهێڵین ئازاری جەرگمان دەرکەوێت.

*** ئەو هەفتەیەی لەوێ مانەوە، چەند کەس دەبوون.؟**

– ئێمە خۆمان هەر ئەوانەی خزم بووین شەش حەوتێ بووین و ناسیاوی چەند گوندێ تریش یەکمان گرتبوو، بۆیە زۆربووین.

*** هەمووتان هاوڕابوون لەسەر ئەوەی یەک بڕیار بدەن، بەو جۆرە بمێننەوە یان تەسلیم ببنەوە.؟**

– کوورە نەوەڵا راستیەکەی بڵێین لە کوێ هاوڕابووین، هەرکەسێکمان لە دڵی خۆمانا رۆژی چەندین جار رامان دەگۆڕی، جارێ بەخۆتت دەووت خۆزگە هەر لەگەڵ ژن و منداڵەکان بووایام باشتر بوو هەرچیەکمان بەسەر بهاتایا بەس نەبوو پێکەوە بووین. جارێ دەتووت کارێ باشم کرد ژن و منداڵەکانم ناردەوە ئەگەر شتێ بوو خۆشم لەناو چووم بەڵام ئەوان رزگاریان بێت قیروسیا لەخۆم. رۆژ وابوو چەندینجار دەهاتیتە سەر ئەو باوەڕەی بچیت خۆت تەسلیم بکەیت و پەشیمان دەبوویتەوە، ئیتر لەکوێ هەموومان وەک یەک بیرمان دەکردەوە. رەنگە هەموومان لەوەیا وەک یەک بوو بێتین کە ئاوا راڕابووین و هەرسەعاتی شتێکمان دەووت. ئەمە نەک هەر لە دڵی خۆماندا کاتێ کە پێکەوە قسەشمان دەکرد چی بکەین، روو لەکوێ بکەین.؟ هەموومان ئەم جیاوازی بیرکردنەوەو ئەم راڕاییەمان پێوە دیاربوو.

* ئەی کەواتا چۆن هەمووتان پێکەوە هەفتەیەک مانەوە کە هاورا لەبوون لەسەر مانەوەتان بەو جۆرە.؟

– ئێ کووا هەمومان پێکەوە ماینەوە، هەر ڕۆژەو یەك دوانێ بەلایەکدا دەڕۆیی. هەر لەو هەفتەیەدا لەیەك جیابووینەوە و دووسێ یەك ماینەوە، ئەوەکان چوون بەرەو قادرکەرەم و تەسلیم بوونەوە.

* نازانم، خۆت ووتت ئێمە کۆمەڵێ خزم و هەندێ ناسیاوی گوندەکانی تر، پێکەوە ماینەوە. ئەی کام لەوانەی کە پێشتر پێکەوە بوون، ڕۆیشتن تەسلیم بوون و کێ مایەوە لەگەڵت.؟

– لە راستیا کەس نەیئەتوانی مەسئولیاتی کەس هەڵگرێت، تۆ برای خۆت بوو بیوتایا دەچم تەسلیم دەبمەوە، نەتدەتوانی رێی لێبگریت، چونکە دڵنیا نەبوویت بە مانەوەی خراپتری بەسەر نایات لەوەی ئەگەر بەرەو جەیشەکە بڕوات و خۆی تەسلیم بکات. من کاك (حەبیب) برام دوو سێ ڕۆژ پێکەوە بووین ووتی دەچم تەسلیم دەبمەوە، زۆریش لە من گەورەتر بوو، هیچ زۆری لە من نەکرد تا لەگەڵی بچم بەرەو قادرکەرەم، چونکە ئەو خۆیشی نەیدەزانی هەڵبژاردنی چوون بەرەو قادرکەرەم باشترە یاخود مانەوە لەو هەردەو هەڵەتە، بۆیە نەیدەویست ئەوەی خۆی

دەیەوێ بیکات منیش وەك ئەو بکەم، هەرکەس سەربەست بوو لەوەی چی بڕیارێك دەدات. ئەو ڕۆیشت بەرەو قادرکەرەم، عاسی زاوام و کە ئامۆزاشم بوو ڕۆیشت تەسلیم بووەوە. ئەمان وەك خزم و کەسوکار و کۆمەڵێ خەڵکی تریش هەبوون دەیانم ناسی لە گوندەکانی تری دەوروبەر و خەڵکی ناوچەکە بوون و دەچوون تەسلیم دەبوونەوە. خەڵکیش زۆر مابوەوە کە نەیدەویست تەسلیم بێت و و وەك ئێمە ئومێدی بەوە بوونەو هەردەو هەڵەتانە ببێتە پەنای بۆ ڕزگاربوون لە دەست سەدام.

چەند ڕۆژێك بەخوا وابزانم سێ ڕۆژ دوای کاکەم حەبیب و عاسی ئامۆزام ماینەوە تا ئەوکاتەی کە ئیتر هیچ ئومێدێکمان نەماو بڕیارماندا ئێمەیش وەك ئەو خەڵکە بچین بەرەو قادرکەرەم بێ ئەوەی بزانین چیمان بەسەر دێت.

*** کێت لەگەڵ بوو.؟**

– من و لوقمان تا ئەوکاتە پێکەوە مابووینەوە و پێکەوە بەرەو قادرکەرەم چووین.

*** چی کاتێک بوو کەوتنەڕێ بەرەو قادرکەرەم.؟**

– نازانم هەر سێ ڕۆژ دوای ئەوەبوو کاك حەبیب و ئەوان ڕۆیشتبوونەوە.

*** مەبەستم لەو چرکە ساتەیە کە بڕیاری تەسلیم بوونەوەتاندا و یەکەم هەنگاوتان نا بەرەو ناو سوپا.؟**

– نا، وەڵا بەیانی لەگەڵ خۆرکەوتنا بەرەو قادرکەرەم ملمان نا.

*** هەر ئەو بەیانیە بڕیارتاندا کە تەسلیم ببنەوە و یەکسەر بەرێکەوتن.؟**

– خۆی ئەو چەند رۆژەی بەو شێوەیە لەو هەردەو هەڵەتانەماینەوە، دوو دڵ بووین و زوو زوو دەمانویست شتێك بکەین و پەشیمان دەبوینەوە، رۆژی چەند جارێ دەهاتینە سەر ئەوەی تەسلیم بینەوە و دواتر رامان دەگۆڕی، بەڵام ئەو بەیانیە بە ئیسراحەت بڕیاری خۆماندا و کەوتینەڕێ بەرەو قادرکەرەم، هەر هەنگاوێکمان دەنا وامان دەزانی بۆ ناو ئاگر دەچین، لە راستیشا بۆ ئێمە هەروەك ناو ئاگر وابوو، تۆ وەرە بیهێنە پێش چاوی خۆت سەربازی فیرار بیت و چەکت پێبێت و لەو ناوچانە بیت کە لای ئەوان قەدەغەکراوە و جەیش و جاش و تۆپ و تەیارەی دونیایان هێناوە بۆ دەستگیرکردنی ئێمەومانان و ئێستا خۆت بەپێی خۆت بەرەو ناویان بچیت، زۆر زەحمەت بوو بەڵام هیچ چارەیەکیشمان نەمابوو. ئەوە تاکە ئومێدمان بوو کە ئەگەر بشکوژرێین

لەگەڵ خەڵك و کەسوکارەکەتا بکوژرێیت نەك لەو دەشت و دەرە کەس نەزانێ جەنازەکەشت چی لێدێت، سەگە بەرەڵا یان قەل و داڵ بتخوات.

***  پێشتر پرسیارمکرد و ووتت چەکمان پێ بوو، ئەی کاتێ بەرەو جەبشەکە رۆیشتن تفەنگەکانتان چی لێکرد.؟**

–  وەڵا هەر پێمان بوو.

***  چۆن بیرتان لەوە نەکردەوە چەکەکان لە شوێنێ بشارنەوە، یان فرێی بدەن.؟**

–  بەخوا ئەوکاتە سەرمان لێشێوابوو، بڕوا بکە رەنگە هەر بیرمان نەبووبێت چەکمان پێ بێت باشە، یان پێمان نەبێت. یان رەنگە بیری ئەوەمان هەر نەبووبێت چەك و تاقمەکە بەقەدمانەوەیەن ئاوا سەرگەردان بوبووین.

***  ترسی ئەوەتان نەبوو بە چەکەوە بتانگرن رەنگە وەك پێشمەرگە حسابتان بۆ بکەن، بێ چەك بن رەنگە وەك هاوڵاتی یان هیچ نەبوایا وەك سەربازی فیرار مامەڵەتان بکەن.؟**

– ئاخر نالێم ئەقڵ و هۆشمان وەستا بوو، کاکە کارەساتەکە ئەوەنە گەورە بوو بڕوا بکە هەستت ناکرد ئینسانی یان هەر روح لەبەرێکی و تەواو. ئیتر هەر ئەوەنە عەقڵمان بڕی دەکرد رۆیشتین بەرەو قادرکەرەم.

*** کاتێ بەرەو قادرکەرەم چوون، یەکەم دیمەن بینیتان، چی بوو.؟**

– لە رێگا.؟

*** بەڵێ یەکەم شت کە توشی بوون، یان هاتە رێتان چی بوو.؟**

– وەڵا گوندە رووخاوەکانمان بینی.

*** من مەبەستم لە جەیش بوو، چیتان بینی.؟**

– یەکەمجار جەیشمان نەبینی، ئەو رێگەیەی ئێمە لێوەی چووین بۆ قادرکەرەم جەیشی لێ نەبوو، چەند مەفرەزەیەکی جاشمان بینی.

*** ئێوە ئەوەتان دەزانی ئەو رێگەیە سوپای لێنیە و تەنها مەفرەزەی جاشی لێیە، وا ئەو رێگەیەتان هەڵبژارد.؟**

– نەخێر، ئەو ڕێگەیە دەچوو بەرەو قادرکەرم و ئێمەش دەمانویست بۆ ئەوێ بچین، نەماندەزانی چی دێتە ڕێمان. ڕەنگە بە ڕێککەوت بوبێت یان سەر ڕێگاکان بە جاش گیرابن لە جیاتی جەیش، نازانم ئەوە چۆن بوو، بۆ ئێمە سودفە بوو.

*** چیتان کرد، کاتێ وا دیمەنی ئەوانە دەرکەوتن کە لە ترسیان هەڵاتبوون.؟**

– چی بکەین، هیچ چارەو ڕێگایەکی تر نەبوو، هەر بەرەو لایان دەڕۆیشتین.

*** ئەی جاشەکان کە ئێوەیان بینی وا دوو چەکدار بەرەو رووی ئەوان دەڕۆن، ئەوان چیانکرد.؟**

– وەڵا ئەوانیش هیچ خۆیان تێك نەدا، دیاربوو ئەوان لەسەر ئەو ڕێگەیە چاوەڕێی خەڵکی وەك ئێمەیان دەکرد.

*** خۆیان وایان ووت.؟**

– کێ.؟

*** جاشەکان خۆیان وتیان ئێمە لێرە چاوەڕێی خەڵکانی وەک ئێوە دەکەین.؟**

– ناوەڵا، نە ئێمە پرسیاری شتی وامان کرد و نە ئەوانیش وایان ووت.

*** ئەی چۆن دەزانی ئەوان لەسەر ئەو ڕێگەیە چاوەڕێی خەڵکی وەک ئێوەیان دەکرد.؟**

– مەبەستم ئەوەیە لەوە دەچوو بۆ ئەو کارە لەوێ بوبێتن، چونکە کاتێ ئێمە چووینە لایان یەکسەر لەگەڵمان کەوتنەڕێ بۆ (چەم ئالیاوا) و هیچیان لەگەڵمان نەکرد.

*** ئێوە کاتێ چوون لە جاشەکان نزیک بوونەوە، چیتان کرد.؟**

– چووین سڵاومان لێیانکرد و ووتمان هاتووین خۆمان تەسلیم بکەینەوە.

*** ئێ ئیتر ئەوانیش دەستگیریان کردن.؟**

– ناوەڵا پیاو ڕاست بڕوات هەر سڵاوەکەیان سەندەوە و وتیان پێشمەرگەن، ووتمان نەوەڵا خەڵکی (کانی قادر)ین و عەسکەری فیرارین.

ئیتر وتیان بابڕۆین بەرەو قادرکەرەم لەگەڵ خۆیان بردمانیان.

* چەکتانیان نەکرد.؟

– ئەوان دەنگیان نەکرد، چەکەکان هەر بەخۆمان بوو، ئێمەش هیچمان نەووت، ئیتر تۆزێ هۆشمان هاتەوە و وتمان ئیشەڵا ئەوە راستە کە دەیانووت هەرکەس خۆی بگرێتەوەو تەسلیم بێت حکومەت کەس ناگرێت. لە جاشەکانمان پرسی وەك بزانن حکومەت چی لەو خەڵکە دەکات، وتیان وەڵا مەگەر خوا بزانێ جارێ هەروا خەڵکەکە کۆدەکاتەوە. پێیانمان ووت ئێستا ئێمە بۆ کوێ دەبەن بۆ لای کەسوکارمان ئەوان هەفتەیەك دەبێ هاتونەتەوە. وتیان ئێمە نازانین ژن و مناڵ دەبرێتە قادرکەرەم و زەلام دەبرێتە چەم (ئالیاوا). ئیتر مەگەر خواو سەدام بزانن چی دەبێت.

پێشتر کەمێك دڵمان خۆش بوو کاتێ جاشەکان چەکیان نەکردین، ئومێدمان بۆ گەڕایەوە کە ئیشەڵا ناگیرێین، بەڵام کاتێ ووتیان ژن و مناڵ دەبرێن بۆ قادرکەرەم و پیاوەکان دەبرێنە چەم (ئالیاوا)، ئیتر تەواو هیوا بڕاوبوین و ووتمان ئەمە ئەو ڕۆژەیە لێی دەترساین.

* ئەتان زانی جاشەکان سەر بە چی فەوجێک بوون.؟

- خۆمان نەمان ئەزانی، بەڵام لێیانمان پرسی ئێوە جەماعەت کێن.؟ دیاربوو دوو جەماعەت بوون، وتیان فەوجی (شێخ موعتەسەم) و فەوجی (رەفعەت گلی) ین.

* **زۆر بوون.؟**

- جاشەکان ئەڵێی، یان ئەو خەڵکەی لە چەم ئالیاوا بوون.؟

* **مەبەستم لە ئەو مەفرەزە جاشەیە کە ئێوە تەسلیمیان بوون.؟**

- بەوخوایە ئێستا نازانم بە تەئکیدی بڵێم چەند کەس بوون، رەنگە هەر هەشت بۆ نۆ چەکدار بووبن.

* **ئەو جێگەیە چەنێ لە (قادرکەرەم) ەوە دوور بوو.؟**

- ئەو شوێنەی جاشەکانمان بینی.؟

* **بەڵێ.؟**

- رەنگە هەر چارەکێ بۆ بیست دەقە رێگە بێت بە پێ.

* **ئەی چەم ئالیاوا، چەند دوور بوو.؟**

- هەر نزیك قادرکەرەم بوو؟

*** لەوێ چیتان بینی.؟**

- هەر لە دوورەوە جەیشێکی زۆرمان بینی دەوری ناوچەکەیان گرتبوو، ئیڤا و سەیارە و مودەڕاعە و دەبابەی عەسکەری رەشی دەکردەوە، ئەوەنە جەیشی لێبوو. پێمان رێی ناگرد گیانم کەوتە لەرزین و دڵم خێراخێرا لێی دەدا، هەستم دەکرد هەناسەم کورت دەبێ و دڵە کوتێمە، دەمم وشك دەبوو، تەواو ترسمان لێی نیشت، هەرچەندە لەبەر خەڵك ناو چەم و دۆڵەکەش رەشی دەکردەوە ئەوەنە خەڵك گیرابوو، بەڵام وام دەزانی ئەو هەموو جەیشە بە تەنها چاوەڕیی من دەکەن و بۆ گرتنی من هاتوون ئەوەنە ئەترسام، تا نزیك تر دەبووینەوە زۆرتر ترس دای دەگرتم. هەرچەندە پێشتر ئێمە لە جاشیش هەر دەترساین، بەلام چونکە جاشەکان کورد بوون و چەکیان نەکردین و بە کوردی قسەیان دەکرد لەگەڵمان، ترسەکەمان رەوییبوەوە. بەڵام ئێستا وەزعەکە جیاواز بوو، لە دڵی خۆمدا دەمووت خۆزگە لەو هەردەو هەڵەتانە کۆپتەر بمیکوشتایا ئەگەر کەسیش بە هەواڵی مردنەکەمی نەزانیایا و قەل و داڵ و سەگە بەرەڵا لاشەکەمی بخواردایا، لەوە باشتر بوو بکەومە دەست ئەم زاڵمانەوە، بەخوا ئیتر ژیان وایە کاتێ لە دەشتەکەش بووم دەمووت

بچمەوە و تەسلیم بم، ئەگەر لەگەڵ خەڵکا بشتکوژن باشترە لەوەی لەم دەشتە بە تەنیا بیت، ئێستا خۆزگەم دەخواست لەوێ بمردمایا و بە زیندوێتی نەکەوتمایەتە بەردەستیان.

*** کاتەکەی، کەی بوو کە گەیشتنە چەم (ئالیاوا).؟**

– پێش نیوەڕۆ گەیشتین رەنگە سەعات 10 بۆ 11 بووبێت.

*** ئەو خەڵکەی لەوێ بوون خێزان و ژن و منالیشی تیابوو.؟**

– نەء، تەنها زەلام لەوێ بوو، ئەی نەمووت جاشەکان پێمانیان ووت ژن و منالّ دەبرێن بۆ ناو قادرکەرەم و زەلامیش بۆ چەم ئالیاوا.

*** لەوێ چیان لێتان کرد، ئەو پرۆسەیە چۆن بوو کە جاشەکان ئێوەیان تەسلیم بە جەیشەکە کرد.؟**

– کاتێ بردمانیانە ناو جەیشەکەوە لە چەند شوێنێ وەك بڵێی جێگەی تەسلیم کردنی خەڵکی وەك ئێمە بووبێت، عەسکەر وەستا بوون و دەفتەریان پێ بوو بۆ ناونوسین. لە یەکێ لەو شوێنانە چەکەکانیان لێمان وەرگرت و هەندێ پرسیاری ئاساییان کرد وەك ناوت چیە؟ خەڵکی کوێی؟ تەمەنت چەندە؟ پێشمەرگە بوویت یان هاوڵاتی؟ فیرار بوویت؟

هەر ئەم پرسیارانەیان کرد و ژمارەی چەکەکەیان نوسی و ئیتر بەرلامانیان کردە ناو خەڵکەکەوە.

***   دەتوانی زیاتر ئەو وێنەیەم بۆ باس بکەیت.؟**

–   وێنەی چی.؟

***   ئەو دیمەنەی (چەم ئالیاوا)، هەستت چۆن بوو، چیت بینی.؟**

–   ئا، وەڵا سەرەتا زۆر ترسناك بوو، وەك ووتم هەمووی لە دوورەوە رەشی دەکردەوە لەبەر جەیش و جاش، ئیڤای عەسکەری، دەبابە و ناقیلە و تۆپ، دەتووت مەعەسکەرێکی گەورەیە. ئێمەش زۆر دەترساین، چەند ساڵە خۆمان لە ترسی ئەم جەیشە حەشارداوە، چەند ساڵە راکەڕاك و شەونخونی دەکەین نەکەوینە بەردەستی ئەم جەیشەوە، کەچی ئەوە ئێستا خۆمان لە ناچاریدا بۆ لای دەچین.

رەنگە گێڕانەوەی هەر بەدەم ئاسان بێت، تۆ وەرە بیهێنەرەوە پێشچاوی خۆت چەند جار پەلاماری ناوچەکەت درابێ، تۆپ و تەیارە لە گوندەکەتی دابێ، ئەم جەیشە چووبێت لە سنورەکانی ئێرانەوە رایماڵی بێت و هەموو لادێکانی لەگەڵ زەوی تەختکردبێت، بە چەکی کیمیایی بەربووبێتە گیانی ئەو خەڵکە رەش و رووتە، دەوری ناوچەکەی ئێمەشی

گرتبوو تا هەموومان بەو دەردە بەرێت، لە ماوەی دوو رۆژدا یەك گوندی ناوچەکەی بەپۆوە نەهێشت هەمووی سوتان و لەگەڵ زەویدا تەختی کرد، ئێستا لەم هەموو زەویەی خوا، هیچ دەرویەکی بۆ نەهێشتبیتەوە و ناچار بیت بەپێی خۆت بچیت تەسلیمیان بیت، کە هیچ باوەڕێکیشت بەوە نەبێ بچوکترین رەحمی خوا لە دڵی ئەم سەربازە زاڵمانەدا هەبێت. ترس و نائومێدیەکەشت بە ئەندازەیەك بێت وا بزانی حکومەت ئەم هەموو جەیشەی بەتەنها بۆ گرتنی تۆ هێناوە، کورد دەڵێ رووح لە جێی سەختە و دەرناچێ، ئەگینا ترسەکە ئەوەندە زۆر بوو هەر دەبوو لەو چەمە رووحمان دەرچوایا.

کاتێ جاشەکان ئێمەیان برد بۆ لای جەیشەکە، لەوە دەچوو کە قایمەی هەر فەوجێك بە جیا بووبێت و جاشی هەر مستەشارێك بیەوێ زۆرترین کەس بەرێت و وەك چالاکی بۆ فەوجەکەی خۆی لە سجلی تایبەتی فەوجەکەی خۆیا بینوسێت. وادیار بوو بۆیە جاشەکانیش وەك مەفرەزە لەسەر رێگاو بانەکان بوون تا هەرکەسی وەك ئێمەیان کەوتە دەست، خۆیان بیهێنن و تەسلیمی بکەن وەك ئەوەی ئەوان ئێمەیان گرتبێت و بەچالاکی بۆ ئەوان حساب بکرێت.

لەناو (چەم ئالیاوە) کە جەیشەکەی لێ بوو، لە چەند شوێنێ دیار بوو بۆ ناونسینی ئێمەومانان دانرابوو، بردمانیانە لای یەکێ لەو دەفتەر بەدەستانەی ناویان دەنوسی، یەکسەر بە ئێمەیان ووت چەکەکانتان دانێن و پرسیاری ناو و ناونیشان و ئیش و کارت و موالید و دواتر ژمارەی

چەکەکانیشیان نوسی. بەوەیا دەمووت دیار بوو ئەم جاشانە پێشتر چەند جارێك خەڵكی تریان بردووە و تەسلیمیان کردووە چونکە خۆ ئەوانیش وەك ئێمە جلی کوردیان لەبەر بوو، وەك ئێمە چەکیان پێ بوو، هیچ شتێ بە رووخساریانەوە دیار نەبوو تا جیایان بکاتەوە لە ئێمە، تەنها شت ئەوە بوو کە دیاربوو ئەوانیان دەناسیەوە، ئەگینا بۆ بەوانیشیان نەووت چەکەکان دانێن و ناویان بنوسن. مادام ئەوە رووی نەدا دیار بوو عەسکەرەکان جاشەکانیان دەناسیەوە. لە دڵ خۆما دەمووت ئێ ئەم موستەشار و جاشانە خوا بیانگرێت مادام بۆ ئێمەیان برد بۆلای عەسکەرەکان و تەسلیممانیان کرد، ئایا ناکرا هەر بەدبەختێ وەك ئێمە کە دەهاتەوە تەسلیم بێت بمانیانخستایەتە ناو جاشەکانەوە و خۆ حکومەت هەر وایدەزانی ئێمەش جاشین، خۆ مۆر لە ناوچەوانمان نەدرابوو تا لەوان جیاواز دەرکەوین. زۆر ئەسەفم بۆ ئەوە دەخوارد لای خۆی کورد و خەڵکی ناوچەکە بوون، ئایا هەست و ویژدانیان نەبوو کە ئەم هەموو کوردە بەو دەردە دەبەن، خۆم دەمووت بەخوا یان ئەوەتا نەیانزانیووە وامان بەسەر دێت، یان زۆر بێ هەست و بێ ویژدان بوون، چونکە ئەوان دەیانتوانی ئەگەر هەموو ئەو خەڵکەش رزگار نەکەن ئەوە بەشی زۆری ئەو گەنج و جاحێڵانەی هاوتەمەنی جاشەکان خۆیان بوون، لەناو فەوجەکانیان بیان شارنەوە، بەڵام نەیانکرد و قوڕ کرا بەسەر ئەو هەموو گەنجە جوان و نازدارەی کورددا و هەموویان برد لە بیابانەکان کردیانیانە ژێر خۆڵەوە.

ئیتر دوای ناونوسین و هەندێ پرسیار و جواب، ئێمەیان خستە ناو خەڵکەکەوە کە ئەوان پێش ئێمە لەوێ کۆکرابوونەوە، بۆیە ووتم سەرەتا زۆر ترسناك بوو. چونکە دوای ئەوەی چەکمانیان کرد و ناومانیان نوسی، ئیتر بەرەڵای ناو ئەو چەمەمانیان کرد و خۆیان تەنها چوار دەورمانیان گرتبوو. لەناو چەمەکە هەمووی خەڵکی وەك ئێمە و خەڵکی گوندەکانی ناوچەی قادرکەرەم بوون. بەو هۆیەوە ووتمان پشت بەخوا هیچمان لێناکەن، مادام ئەو هەموو خەڵکە پێکەوەیە رەنگە ئەوە راست بێت کە بمانبەنە شارەکان و لە موجەمەع دامانئێن، کەمێك ترسەکەمان رەوییەوە و ئومێدێکمان لادروست بووەوە کە ئەمجارەش خوا گەیشتۆتە فریامان و هۆشێك کەوتەوە بەرمان.

*** کاتێ بردتانیانە (چەم ئالیاوا) و تێکەڵ خەڵکەکە بوون، هیچ کەسێکت ناسیەوە لەناو ئەو خەڵکەی پێش ئێوە لەوێ کۆکرابوونەوە.؟**

– کوورە ئائا، هەمووی خەڵکی ناوچەکەی ئێمە بوون. دیاربوو ئەوەی پێشتر لەوێ بوو ئەوانیش هەر چاویان دەگێڕا بزانن کێی تر دەهێنن، یان رەنگە چاوەڕێی برا و کەسوکاری خۆیان بووبێتن، بۆیە کە ئێمە چووین زۆرێکی بەرەو لامان دەهاتن بۆ هەواڵ پرسین لە کوێ بوون، فلان، فیسارتان نەبینی لەو هەردەو هەڵەتانە.؟ خەڵکی تیابوو پێشتر تەسلیم

بوو بوو، براو کەسوکاری تری هێشتا لەو هەردە و چەم و شیوانە بوون، بۆ هەواڵ پرسین لە ئێمە بەشێکی بۆلامان هاتن. بەتایبەت ئەوەی ناسیار بوو بەدەممانەوە هاتن.

*** ئەی تۆ پرسیارت لەوان کرد کە ئایا ئەوانیش برا و کەسوکارەکەی تۆیان نەبینیووە.؟**

– چۆن نەمان پرسی، هەر ئەوکاتەی گەیشتینە ئەوێ، ئەوانمان بینیەوە.

*** ئەوان چۆن برابوون بۆ ئەوێ، تۆ نەتووت چەند رۆژی پێشتر چوون بۆ قادرکەرەم.؟**

– بەڵێ، ئەوان خۆیان چوون بۆ قادرکەرەم و وەك ئێمەشیان بەسەر نەهاتبوو کە توشی مەفرەزەی جاشبن و بیانبەن بۆ چەم ئالیاوا، هەر راستەوخۆ چووبوونە قادرکەرەم، بەڵام جەیش گرتبویانی و بردبویانی بۆ چەم ئالیاوا. دیاربوو لە هەر شوێنێ لە ناوچەی قادرکەرەم خەڵکیان گرتبێت هەر گواستبویانەوە بۆ چەم ئالیاوا. وەك بڵێی شوێنێك بوو بۆ کۆکردنەوەی (نێرینە)ی مەنتیقەکە.

*** لحەبیبـا برات، چەکی پێ بوو کاتێ بەرەو قلدرکەرەم رۆیشت.؟**

– نانا، ئەو چەکی پێ نەبوو. کاکە مەسەلەکە ئەوە نەبوو ئەوەی چەکی پێبێت بیگرێت و بێ چەك نەگرێت، بەشی زۆری ئەوەی چەکیشی پێ نەبوو بوو هەوڵی دابوو چەك پەیدا بکات کاتێ خۆی تەسلیم دەکاتەوە، چونکە دیعایەیەکیان کردبوو ئەگەر چەکت پێ بێت کە تەسلیم دەبیت باشترە لەوەی بێ چەك بیت، بۆیە زۆرێك لەوانەی لە لادێکانەوە بێ چەك بوون و چووبوون خۆیان تەسلیم کردبوو، کەسوکار و خزم و ناسیاویان راسپاردبوو هەرچۆنێکە چەکمان بۆ بکڕن، چونکە خەڵکەکە سەری لێشێوابوو کەسێکیش نەبوو رێنمایی ئەو خەڵکە بکات چی بکات باشە، بۆیە زۆربەی باوەڕی کردبوو کە ئەگەر بەچەکەوە تسلیم بیت ئەوە لە فەوجێکدا نەشرت دەکەن و دەتکەن بە چەکدار.

*** کێ ئەو دیعایەی بڵاو کردبۆوە.؟**

– وەڵا لە راستیا نازانرێت کێ بووە، بەڵام رەنگە مستەشارەکان بووبێتن و رەنگە حکومەت خۆیشی بووبێت.

*** ئەوەی بە چەکەوە تەسلیم بوو، لەگەڵ ئەوانەی بەبێ چەک تەسلیم بووبوون، هەموو هەر پێکەوە بوون لەچەم ئالیاوا.؟**

– بەڵێ، ئەی ناڵێم من و کاك حەبیب برام لەوێ یەکمان گرتەوە ئەو بەبێ چەك تەسلیم بوو بوو، منیش بەچەکەوە تەسلیم بووم و لەوێ یەکمان گرتەوە و تا ئەوکاتەی لە قاعەکان (تۆپزاوا) ئامادە دەکراین بۆ گوللەبارانکردن، هەر پێکەوە بووین.

*** وەك بزانی، لە سجلی ناونوسینەکە چەکدار و بێ چەك هەر لە یەك سجل ناویان دەنوسرا.؟**

– وەڵا من و کاك لوقمان کە پێکەوە تەسلیم بووین هەردووکمان چەکمان پێبوو، پێکەوە لە سجلێك ناومان نوسرا، براکەشم کە بەبێ چەك تەسلیم بوو بوو لەگەڵ ئەوانەی تر کە پێکەوە گیرابوون و هەبوو چەکی پێ بوو، هەبووە پێی نەبووە هەمویان هەر لە سجلێك ناونوس کرابوون، بەگوێرەی ئەوەی چەکدار بوویتایا دەیانوسی چەکدار و ژمارەی چەکەکەیان دەنوسی و بێ چەکیش بوویتایا دەیانوسی بێ چەك، دیار بوو جیا نەکرابوونەوە و خۆ دوایی دەرکەوت نەك پیاوی چەکدار و بێ

چەك جیاوازی نەکران، ژن و منالّی بەرمەمکە و پێشمەرگە و فیرار و کاسب و شوان و گاوان پێکەوە خرانە گۆڕە بەکۆمەڵەکانەوە.

* **چەند رۆژ لە چەم ئالیاوە هێشتانیانەوە.؟**

– نازانم ئەو خەڵکەی تر چەند رۆژ بوو لەوێ بوون، تەنانەت لە کاك (حەبیب) براشم پرسی ووتی کە ئێمەشیان هێناوە پێش ئێمە خەڵکی لێ بووە، دوور نیە هەر لە یەکەم رۆژی پەلاماردانی ناوچەکەوە ئەم شوێنەیان دانابێ بۆ کۆکردنەوەمان، بەلاّم ئەو رۆژەی ئێمە براینە ئەوێ، ئەوە دوواڕۆژی کۆکردنەوەی خەڵك بوو لە (چەم ئالیاوا)، چونکە هەر ئەو رۆژە گواستمانیانەوە.

* **پێش ئەوەی بتانگوێزنەوە، ئەو مستەشار و سەربازانەی لەوێ بوون، هیچ قسەیان بۆتان نەکرد، چیتان لێدەکەن، بۆ کوێتان دەبەن.؟**

– بەڵێ، پێش ئەوەی سەیارە بێنن بۆ گواستنەوەمان، خەڵکەکەیان هەموو کۆکردەوە و قسەیان بۆمانکرد، پێمانیان ووت هەر ئێستا دەتانگوێزینەوە.

*** لەکوێ کۆیان کردنەوە.؟**

– هەر لەناو چەمەکە، چونکە فراوان بوو بانگەوازیانکرد خرببینەوە، ئێمەش هەموو کۆبووینەوە و ئەوان کەوتنە قسەکردن بۆمان.

*** بەچی قسەیان دەکرد.؟**

– بە سەماعەی دەستی.

*** دەستخۆش بیری ئەوەم نەبوو ئەو پرسیارە بکەم چۆن دەنگیان پێتان دەگەیشت.؟ من مەبەستم لە زمانی قسە کردنەکەیان بوو.؟**

– بە عەرەبی قسەیان دەکرد و یەکێك دەیکرد بە کوردی.

*** لە بیرت ماوە، چیان ووت.؟**

– وەڵا زۆر قسەیانکرد، بەشێکی هەر باسی سەدام بوو وەسفی سەدامیان دەکرد و بەشێکیشی باسی ئێرانیان دەکرد و جنێوویان بە سەرکردەکانی کورد و بە پێشمەرگە ئەدا و ئەیانووت (عەمیلی ئێران) بوون و ئەوان سەبەبی ئەوە بوون کە ئێوە واتان بەسەر بێت.

بەهەرحاڵ ئەوەی پەیوەندی بە ئێمەوە بوو، وتیان دەتانبەین بۆ چەمچەماڵ لە لیواکەی چەمچەماڵ ناونوس دەکرێن و وەرقەی رێگەپێدانتان بۆ دەکرێت هەرکەس دەگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی خۆی کەلو پەل و ماڵەکانتان دەگوێزنەوە لە شارەکان موجەمەعتان بۆ دروست دەکرێت و دەبێ ئیتر لە موجەمەعات بژین.

*** باوەڕتان بەو قسەیە هەبوو.؟**

– وەڵا لە راستیا خەڵکەکە ئەوەنە سەرگەردان بووین، زۆرێکی باوەڕی دەکرد و بەو دیعایەیەشەوە هاتبۆوە کە حکومەت کەس ناگرێت. بەڵام کە بیریشم دەکردەوە ئەو هەموو گوندەکانی سوتاند و لەگەڵ زەوی تەختیکرد و مەڕوماڵاتیان هەموو بەتاڵان برد، یەعنی چی دەڵێن دەتابەین بۆ چەمچەماڵ لە لیواکەی چەمچەماڵ ناونوس دەکرێن و وەرقەی رێگەپێدانتان بۆ دەکرێت هەرکەس دەگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی خۆی کەلو پەل و ماڵەکانتان دەگوێزنەوە لە شارەکان موجەمەعتان بۆ دروست دەکرێت، بۆیە هەر ترسی ئەوەم هەبوو کە حکومەت نیازی خراپە لەگەڵمان.

*** ئەوکاتەی ئەوان قسەیان بۆتان دەکرد، هیچ کەس پرسیارێکی نەکرد، هەر شتێ بڵێن، ئەی کە دەتانەوێ بمانگوێزنەوە بۆ موجەمەع بۆ بەکیمیایی لێمان ئەدەن، بۆ دێیەکانتان سوتاند.؟**

– ناوەڵا پرسیاری چی، کێ دەیوێرا قسەیەك بكات.

*** هەڕەشەیانکرد کە نابێ کەس قسە بکات، یان پێشتر کەسێک هەبوو بتانترسێنێ کە خراپە هیچ قسەیەک مەکەن.؟**

– نەوەڵا کەس وای پێمان نەووت، بەڵام ترس و خەوفەکە ئەوەنە زۆر بوو کەس جورئەتی ناکرد قسە بکات و ئەگەر یەکێ قسەی وایبکردایا رەنگە هەر لەوێ هەموومانیان بکوشتایا.

*** تا ئەوکاتەش هیچ هەواڵێکی خێزان و کەسوکارتان نەدەزانی.؟**

– ناوەڵا، کە من چووم بۆ چەم ئالیاوا کاتێ کاك حەبیب برامم بینی یەکەم قسە پرسیاری دایکم و ژن و مناڵەکانم کرد، ئەویش ووتی هیچیان لە بارەوە نازانم. ئەو خەڵکەی لەوێ بوون زۆربەی وەك ئێمە لە ژن و مناڵ دابڕابوو، تەنها دەیانووت ژن و مناڵ لە قادرکەرەمن ئیتر هیچی ترمان لە بارەیانەوە نەدەزانی.

*** کەی دەستیان کرد بە گواستنەوەتان.؟**

– هەر هەمان ڕۆژ.

*** بەڵێ پێشتر ووتت هەمان ڕۆژ، مەبەستم کاتەکەیەتی سەعات چەند بوو.؟**

– وەڵا تەقریبەن هەر دوو بۆ سێ سەعاتێ دەبوو ئێمە گەیشتبووین، دەوری دوای نیوەڕۆ، نزیك عەسر بوو.

*** نازانی ڕۆژی چەند شەمە بوو.؟**

– نا بەخوا ئەوانەم بیر نیە.

*** ئەی ئەگەر بیرت بێت چەندی مانگ بوو.؟**

– وەڵا نازانم بە تەواوی چەندی مانگ بوو، بەڵام ڕەنگە لە دەور 10 و 11ی مانگی 4 بووبێت.

*** جۆری ئەو سەیارانەی هێنابویان بۆ ئەوەی ئێوەی پێ بگوێزنەوە چی بوو.؟**

– هەمووی کۆستەر و مەسلەحە درێژەکان بوون.

* **زۆر بوون.؟**

– ئێمە.؟

* **نا، سەیارەکان دەڵێم.؟**

– ئارەوەڵا زۆر زۆر بوون.

* **سەیارەکان عەسکەری بوون.؟**

– نەخێر هەمووی سەیارەی 21 نەفەری و ئامانەی درێژی مەدەنی بوو.

* **سایەقەکان چی بوون.؟**

– هەر مەدەنی بوون.

* **کورد بوون یان عەرەب بوون.؟**

– هەمووی کورد بوو، ئەوانیشیان بە سوغرە گرتبوو، بە زۆر هێنابوویان.

* **چۆن سواری سەیارەکان کران.؟**

- سەیارەکان هەموو بە دوای یەکتریەوە راوەستا بوون، ئێمەش هەر بە ریز راوەستاین و سەیارە لە دوای سەیارە پڕ دەکرا و سەیارەیەکی تر دەهاتە پێشەوە و بە دوای ئەودا دەچووە سەر ڕێگاکە و هەمووی بەدوای یەکتریدا ریزبووبوون دەتووت دەنك تەزبیحە ئەوەنە زۆر بوون.

*** هیچ جاش یان سەربازێك لەگەڵتان سوار بوون.؟**

- جاش نەخێر، بەڵام هەر سەیارەی یەك جوندی لەگەڵ خەڵکەکە سوار بوو.

*** چەکی پێ بوو.؟**

- ئەی چۆن خۆ بۆ هەوەس سوار نەبوو، بۆ ئەوە سەردەکەوت حیمایەی خەڵکەکەی ناو ئەو سەیارەیە بکات.

*** تۆ نازانی چەنەم سەیارەبوو سەرکەوتی.؟**

- چۆن یەعنی.؟

*** مەبەستم ئەوەیە کاتێ ئێوە بە ڕیز راوەستابوون و تا سەیارە لە دوای سەیارە پڕ دەبوو، ئەو سەیارەیەی تۆ بەری کەوتیت تا بتگوێزنەوە، پێش ئەو، چەند سەیارەی تر پڕ کرابوون.؟**

- ئا، وەڵا ئەم ژمارد، بەڵام زۆر زۆر بوو.

*** جۆری سەیارەکە چی بوو.؟**

- ئەمووت هەمووی کۆستەر و مەسڵەحە درێژەکان.

*** مەبەستم ئەو سەیارەیەیە کە تۆی گواستەوە.؟**

- کۆستەری 21 نەفەری بوو.

*** نازانی تابلۆی سەیارەکە چی شارێک بوو.؟**

- نەبەخوا.

*** ئەی ئەگەر تەماشات کردبێت ژمارەی سەیارەکە چەند بوو.؟**

- ناڵێم بەخوا نازانم، کێ بیری ئەوەی هەبوو تەماشای رەقەم سەیارەکە بکات.

*** لەناو سەیارەکە هیچ ناسیاوێکت لەگەڵ بوو.؟**

- بەڵێ، کاک حەبیب برام و لوقمان و کۆمەڵێ خەڵکی تریشم دەناسی خەڵکی گوندەکانی تری دەوروبەرمان بوون، لە ناو یەک سەیارە بووین.

***   ئەوكاتەی سەریانخستن بە ناو خوێندنەوە بوو، یان هەروا هەڕەمەکی و بەپێی ئەو ریزەی خۆتان راوەستابوون.؟**

– ئەوان کاتێ سەیارەکانیان هێنایە پێشەوە و بە خەڵکەکەیان ووت بە ریز سەرکەون، ئێمەش بە دوای یەکتریدا بەرەو سەیارەکان چووین و هیچ ناو نەنوسراو ناویش نەخوێندرایەوە.

***   ئەی چۆن وا رێککەوت خۆت و براکەت و لوقمان و چەند ناسیاوێک پێکەوە بچنە سەیارەیەکەوە.؟**

– ئەی نالێم ئەوان ووتیان ریزبن بەرەو سەیارەکان، ئێمەش خۆمان بەدوای یەکتریەوە راوەستاین بۆ ئەوەی پێکەوە بین.

***   ئەوکاتەی ریزکران بەرەو سەیارەکان، جاش، یان جەیش لە دەورتان بوو.؟**

– ئەی نەمووت یەك جوندی لەگەڵمان سواربوو.

***   ناو سەیارەکە نالێم، شوێنی ریزەکەی ئێوە بەرەو سەیارەکان و دەوروبەری سەیارەکان دەڵێم.؟**

– بەڵێ، وەڵا جەیش و جاشیش هەر لەو ناوە بوون.

*** ئەی لە ڕێگە، جگە لەو سەربازەی ناو سەیارەکانتان هیچ کەسیتر پاسەوانی دەکردن.؟**

– بەڵێ، هەموو ڕێگاکان عەسکەر گرتبووی و مەفرەزەی جاش و جەیشیش لەناو ڕەتڵی سەیارەکان بوون لە پێش و دوامانەوە و لە نێوان هەر چەند سەیارەیەك نەفەر، سەیارەیەك چەکدار لە ناومان بوو. لە ئاسمانیشەوە هەلیکۆپتەر بەسەر ڕەتڵی سەیارەکانەوە بوو تا ناو لیواکەی چەمچەماڵ.

*** چەند بەڕێوە بوون، تا گەیشتن بە چەمچەماڵ.؟**

– لە ڕاستیا ڕێگەکە ڕەنگە هەر سەعاتێ بێت، بەڵام ئێمە نزیك خۆرئاوا گەیشتین، لەوە دەچوو دوو سەعات زیاتر بەڕێوە بووبێتین.

*** بۆ.؟**

– ئاخر سەیارەکان زۆر بوون وەك قافڵە دەڕۆیی، لەسەر خۆ دەڕۆیشتن و لە (بان مەقان)یش هەندێ ڕاوەستان، بۆیە زیاترمان پێچوو.

*** لە (بانی مەقان) بۆچی ڕایانگرتن.؟**

- نازانم بۆ، بەڵام زیاتر لە نیوو سەعات هەموو سەیارەکان لەشوێنی خۆمان لەسەر جادەکە راوەستاین.

*** کاتێ گەیشتنە لیواکەی چەمچەماڵ، دایانگرتن.؟**

- نەخێر.

*** ئەی لە (چەم ئالیاوا) پێیان نەوتن دەتانبەن بۆ لیواکەی چەمچەماڵ و نوسراوتان بۆ دەکەن و شتی وا.؟**

- بەڵێ، لە (چەم ئالیاوا) ئەوکاتەی بە (سەماعە) قسەیان بۆ کردین وتیان دەتانبەین بۆ لیواکەی چەمچەماڵ و لەوێ وەرەقەی رێگە پێدانتان بۆ دەکەین تا بگەڕێنەوە بۆ گوندەکان و کەلوپەل و ماڵەکانتان بەرن لە ئۆردوگاکان شوێنتان بۆ دیاریکراوە. بەڵام کاتێ بردمانیانە لیواکەی چەمچەماڵ بۆمان دەرکەوت ئەو قسانە هیچی راست نەبوون. چونکە ئەگەر ئەوان بۆ ئەوە ئێمەیان بردبوو کە وەرەقەی رێگە پێدانمان بۆ بکەن، چی پێویستی بەوە بوو لە ئەرزو ئاسمانەوە بەو شێوەیە پاسەوانیمان بکەن، لە قادرکەرەمەوە پاسەوان لەگەڵمان بووەو کۆپتەر بە ئاسمانەوە، کاتێ بردمانیانە ناو لیواکەی چەمچەماڵەوە دنیایەك جەیشی تری لێبوو، چواردەوری هەموو ئەو ناوچەیە گیرابوو، سەر

رێگاکان و له ئاسمانیشه‌وه هه‌لیکۆپته‌ر په‌یتا په‌یتا به‌سه‌ر لیواکه و بان چه‌مچه‌ماڵیشدا ده‌سوڕایه‌وه. هه‌موو ئه‌و سه‌یارانه‌ی ئێمه‌یان هێنابوو به‌ڕیز راوه‌ستێنران و کۆمه‌ڵێ سه‌یاره‌ی تریش دیار بوو پێشتر برابوون بۆ ئه‌وێ نازانم له‌چی شوێنی تره‌وه هێنرابوون، له‌وێ کۆکرابوونه‌وه. زۆر زۆر خه‌ڵکی لێبوو.

ئه‌و جوندیه‌ی له‌ناو سه‌یاره‌که‌مان بوو دابه‌زیه خواره‌وه و کۆمه‌ڵێ عه‌سکه‌ری تری ده‌فته‌ر به‌ده‌ست هاتن و دابه‌ش بوون به‌سه‌ر سه‌یاره‌کانی ئێمه‌دا و که‌وتنه ناونوس کردنمان. پرسیاری ناو و ناونیشان و ژن و منداڵ و مه‌والید و ئیشوکارت و کاتی ته‌سلیم بوونت چه‌کت پێ بووه یان نا، ئه‌مانه و کۆمه‌ڵێ پرسیاریان کرد و ده‌رگای سه‌یاره‌که‌یان داخسته‌وه و له‌شوێنی خۆمان راوه‌ستاین.

*** سایه‌قی سه‌یاره‌کان هه‌ر له‌ناو سه‌یاره‌کان بوون.؟**

– به‌ڵێ.

*** ئه‌وکاته‌ی هیچ سه‌ربازێک له‌ناو سه‌یاره‌که‌تان نه‌ما، له‌گه‌ڵ شۆفێره‌که‌تان قسه‌تان نه‌کرد، که ئه‌وه چیه رووده‌دات.؟**

– به‌ڵێ، قسه‌مان له‌گه‌ڵ کرد، ووتی وه‌ڵا که‌س نازانێ چیتان به‌سه‌ر دێت، هه‌روا خه‌ڵکه و ده‌ستگیرده‌کرێت و له هه‌موولایه‌که‌وه کۆده‌کرێته‌وه

و ئەتانبەن بەرەو کەرکوك، ئێمە ئەوەنە دەزانین هەتا (تۆپزاوا) ئاگادارین خەڵکەکە ژن و منداڵ و زەلام هەمووی لەوێ کۆکراوەتەوە، ئیتر لەوێ بەولاوە نازانین مەگەر خوا خۆی بزانێ.

ئێمە تا ئەو کاتە هێشتا ئومێدمان هەبوو کە رەنگە هەر لە لیواکەی چەمچەماڵ ئازادمان بکەن، بەتایبەتی کە جاش و مستەشارەکان داوایان دەکرد خەڵك چەکی پێبێت بۆخۆی باشترە، ساڵی 1975 دەهاتەوە یادمان کە شۆڕش تاوایەوە پێشمەرگە هەمووی بە چەکەوە تەسلیم بوونەوە و برانە شارەکان ناونوس دەکران و دواتر هەمویان ئازاد کران و هەرکەس چوەوە سەر کارو ژیانی خۆی. ئێمەش ئەوەمان کردبووە ئومێدێك بۆ خۆمان رەنگە هەروەك ساڵی 1975 بێت. بەڵام قسەی ئەو سایەقە کە ووتی ژن و منداڵ و زەلام هەمووی دەبرێن بۆ خوار کەرکوکەوە و لە (تۆپزاوا) کۆدەکرێنەوە، هەستمان بە مەترسی زیاتر دەکرد و دەمانووت بەخوا رەنگە ئەمجارە هەمومان تیابچین.

*** لە لیواکەی چەمچەماڵ بەتایبەت دوای ئەوەی جۆرێك نائومێد بوون لەوەی ئازاد بکرێن و بەهۆی قسەی شۆفێرەکەوە زانیتان بەرەو کەرکوك و (تۆپزاوا) تان دەبەن، بیرتان لەوە نەکردەوە کە هەوڵبدەن خۆتان رزگاربکەن.؟**

– ئێ چۆن خۆمان رزگار بکەین، کە ئێمە لە چەم ئالیاوا چواردەورمان بە سەربازگیرابوو تا لیوای چەمچەماڵ و لەوێش برابوینە ناو لیوایەکی سەربازییەوە، بەخوا تا شەو تاریکیش داهات و تا ئەوکاتەی خستمانیانەرێ بەرەو کەرکوک هەر هەلیکۆپتەر بە ئاسماندا دەسوڕایەوە. خوارەوەیش هەمووی جەیش بوو. تەنیا مەدەنیەك لەوێ بوویێت، سایەقەکان بوون. ئیتر لەناو ئەو هەموو عەسکەرە و بە نەشارەزایی چۆن خۆت رزگار دەکەیت. بەخوا تا ئەوکاتە من چەمچەماڵم هەر نەبینی بوو، حکومەت لە چەمچەماڵ ئازادیشمانی بکردایا من نەمدەزانی بۆ کوێ بچم. بەشی زۆری گەنجی لادێکان بە ژیانی ئاسایی لادێوە خەریك بووین و لەوەتەی هەبوون ئەوەنە لە حکومەت ترسابوون نیووەی ئەو خەڵکی هیچ شارێکی نەبینی بوو.

*** تا کەی لە لیواکەی چەمچەماڵ هێشتانیانەوە.؟**

– نەمووت هەر کە گەیشتینە لیوای چەمچەماڵ دەستیان کرد بە ناونوسین تا هەموو سەیارەکان ناونوسینکردنیان تەواو کرا، تاریك داهات و ئیتر سەیارەکان هەمووی و هەر بەدوای یەکتریدا بەرەو کەرکوك بەرێخران.

*** کەواتا هەر بە سەیارەی لمەدەنی) گوێزرانەوە بۆ کەرکوک.؟**

– بەڵێ، هەر ئەو سەیارانەی لە (چەم ئالیاوا) بوون و لەوێوە بەرێخراین بۆ لیواکەی چەمچەماڵ، دوای ناونوسین هەر بەهەمان سەیارە و هەرکەس هەر لەسەر هەمان کورسیەکانی خۆمان براین بۆ کەرکوک و بۆ سەربازگەی (تۆپزاوا).

*** مەفرەزەی جاشەکان کە لە قادرکەرەمەوە بۆ چەمچەماڵ لەگەڵتان بوون، لە چەمچەماڵیشەوە بۆ کەرکوک و سەربازگەی (تۆپزاوا) هەر پاسەوانتان بوون.؟**

– نەخێر، ئەوان هەر لە رێگەی گواستنەوەمان لە قادرکەرەمەوە بۆ چەمچەماڵ پاسەوانی رەتڵی سەیارەکانی ئێمەیان دەکرد، کاتێ گەیەندراینە لیوای چەمچەماڵ ئیتر ئەوان لە نزیکمان نەمان و لە بردنیشمان بۆ کەرکوک هەرچەندە شەو بوو، بەڵام هەستمان بەوە نەکرد هیچ مەفرەزەیەکی جاش لەگەڵمان بن.

*** کاتەکەی نازانی، کەی بوو لە چەمچەماڵەوە بەرێخران.؟**

– تاریک داهاتبوو، بەڵام بە سەعات نازانم سەعات چەند بوو.

*** له ڕێگەی نێوان چەمچەماڵ بۆ کەرکوک چۆن پاسەوانی کران.؟**

– هەمان ئەو جوندییەی لە چەم ئالیاوا هاتە ناو کۆستەرەکەوە، دوای ناونوسینەکە لە لیوای چەمچەماڵ جارێکیتر هاتەوە هەمان شوێنی خۆی. لەپێش قافڵەی سەیارەکانەوە سەیارەی عەسکەری و لە دوای قافڵەکەشەوە حیمایە هەبوو، لەناو رەتڵەکەش لەنێوان هەر چەند سەیارەیەك سەیارەیەکی عەسکەری دووابەتاڵی پڕ لە عەسکەری تفەنگ بەدەست هەبوو.

*** کاتێ بەرەو تۆپزاوا بردتانیان، چوونە ناو شاری کەرکوک.؟**

– بەڵێ، پێش ئەوەی بمانبەنە تۆپزاوا بەناو کەرکوکدا رۆیشت، من خۆم لە کەرکوك زۆر ئیشم کردبوو شارەزابووم، دەمزانی ئەمە ناو کەرکوکە. بەناو شاردا تێپەڕین و هەروا 20 دەقیقە لە کەرکوك تێپەڕین گەیشتین بە سەربازگەیەك هەمووی (سیمبەند) بوو، تەلەزییەکی زۆر لەو دەشت و دەرە کرابووە شورا و سەیارەکان بەناو سیمبەندەکەیا رۆیشتن و لەوێش هەمووی سەرباز دەوری گرتبوو، ئینزیباتی عەسکەری زۆر زۆری لێبوو. کاتێ گەیشتینە ئەوێ و سەیارەکان راوەستان ئیتر ئەو خەڵکەمان

لێوە دیاربوو کە کۆکرابوونەوە و کۆمەڵ کۆمەڵ کرابوون و رەشی دەکردەوە.

*** هەر بە سەیارەکانەوە بردتانیانە ناو سەربازگەکەوە.؟**

– بردمانیانە ناو سیمبەندەکەوە، لەوێ سەیارەکان راگیران و جەیشێکی زۆر هاتن بەرەو سەیارەکان، هەروا کۆمەڵێ عەسکەر پەلاماری سەیارەیەکیان ئەداو هەموومانیان بە پەل راکێشان هاوردە خوارەوە و بەشەق و زللە تێمان بەر بوون و هەر لەولای سەیارەکانەوە کۆمەڵمانیان کردە یەکدا. رەفتاریان زۆر ناشرین و ترسناك بوو، هەرا هەرایەکیان بوو هەر مەپرسە، بەو جۆرە هەموومان لە سەیارەکان دابەزێنراینە خوارەوە و دوای ئەوەی کۆمەڵ کۆمەڵ کراین، سەیارەکان برانە دەرەوەی سیمبەندەکە و ئیتر ئێمەیان بەدەم لێدانەوە برد بەرەو ناو سەربازگەکە، کە سەربازگەیەکی زۆر گەورە بوو. لە هەموو لایەکەوە چواردەورمان گیرابوون و لە دواشەوە بە شەق و قۆناغە تفەنگ کەوتنە تێهەڵدانمان تا بردمانیانە نزیکی ئەوانەی کە یان پێش ئێمە لە سەیارەی تر دابەزێنرابوون و برابوونە ئەوێ یان رۆژانی زووتر لەوێ کۆکرابوونەوە. خەڵکەکە لە ژمارە نەدەهات، باوەڕ بکەن دەرزیت هەڵدایا بەر زەوی

نەدەکەوت لەبەر خەڵك، هەمووشی هەر وەك ئێمە لەسەر  ماڵ و حاڵی خۆی دەستگیر کرابوون و هێنرابوون بۆ تۆپزاوا.

***   ئەوانیش وەك ئێوە هەر گەنج بوون.؟**

–   ئەوەی تۆپزاوا.؟

***   بەڵێ ئەو خەڵکەی پێش ئێوە لە تۆپزاوا کۆکرابوونەوە.؟**

–   سایەق 21 نەفەریەکە لە چەمچەماڵ پێی وتین دەتان بەن بۆ تۆپزاوا و ژن و منالێش هەمووی لەوێ کۆکراوەتەوە، بەڵام باوەڕم نەدەکرد بەوجۆرەبێت کە بە چاوی خۆم بینیم. هەموو جۆرێکی تیابوو، هەزاران منالّ، هەزاران ژن، کچە عازەب، کوڕی گەنج، پیرێژن و پیرەمێرد. ئەوەی لەوێ بینیم ووتم یەك کوردی تر نەماوە هەمووی لێرەیە.

بەیانی ئەمڕۆش کە خۆمان تەسلیم بە جاشەکان کرد و پرسیاری ژن و منالّەکانمان کرد وتیان هەر ئەوەنە دەزانین ئەوان لە قادرکەرەمن زەلامەکان دەبەن بۆ چەم ئالیاوا، هەرچەند قەناعەتمان وابوو رەنگە ئەوانیش دەستگیر کرابن، بەڵام هەر باوەڕو ورەیەکمان لای خۆمان دروست دەکردەوە کە رەنگە ژن و منالّەکانم دەستگیر نەکرابن و لە قادرکەرەم رزگاریان بوو بێت، بەڵام کاتێ ئەو حەشاماتەی تۆپزاوام بینی

ئیتر نەك هیچ ئومێدێکم نەما، بەڵکوو وتم ئەوە بە دڵنیاییەوە گیراون و ئیتر خۆزگەی ئەوەم دەخواست ئەگەر لەناو سەیارە یان لە ناو سجنیش بێت و ئەگەر لە دووریشەوە بێت تەنها یەك جاری تر چاوم پێیان بکەوێتەوە. ئەمووت خوایە وەك چۆن لەو هەردانەی قادرکەرەم لەگەڵ حەبیب برام جیابووینەوە و دواتر لە چەم ئالیاوا بەیەك گەیشتین، لێرەش خێزان و منداڵەکان و دایکم ببینمەوە، لەبەر ئەوەی باوەڕم وابوو کە بەدڵنیاییەوە دەستگیرکراون بۆیە دەپاڕامەوە خوایە لێرە لە تۆپزاوا بن. هەرچەندە خەڵکەکە ئەوەنە زۆر بوو ئەگەر ڕێگەتیان بدایا و بە ئازادی بەناو ئەو خەڵکەیا بگەڕایتایا رەنگە بە دووسێ ڕۆژ نەتوانیایا هەمووی ببینی، ئیتر لەکوێ تۆ خۆت سجن بیت و بتوانی لەو قەرەباڵغیە سجنی تر ببینیتەوە، بەڵام هەر ئومێدم بەخوا هەبوو کە ئیشەڵا بۆ تەنها جارێکیش بێت خوا وادەکات چاوم پێیان بکەوێت.

*** من پێشتر بیرم چوو بپرسم ئێوە لە هیچ شوێنێ تەفتیش کران.؟**

– هەر پێش نیوەڕۆ کە گەیشتینە (چەم ئالیاوا) ئەوکاتەی چەککراین گیانمان گەڕان.

*** بۆچی دەگەڕان، چی شتێکیان لێتان سەند.؟**

– دیاربوو بۆ دەمانچە و قەچۆو ئەوشتانە دەگەڕان. من خۆم جگە لە چەکەکەم هیچم پێ نەبوو بەڵام لەو شوێنەی چەکیان کۆکردبۆوە بینیم چەقۆ و نینۆکبڕ و ئەوشتانە لەوێ خڕکرابوون.

*** ئەی لە تۆپزاوا گیانتان لەگەڕان.؟**

– یەکەمجار نەخێر، ئەوکاتەی لە سەیارەکان دامانیانگرت ناڵێم هەر بەشەق و تێهەڵدان بردمانیانە ژوورەوە، بەڵام ئەوکاتەی لەوێش جارێکیتر ناونوس کراین و بردمانیان بەرەو قاعەکان، پێش ئەوەی تەحیقیقمان لەگەڵ بکەن ئەمجارە هەموو لەشمان گەڕان، ئەگەر هەر جلوبەرگێ عەسکەریت لەبەر بوایا پێتیان دائەکەند وەك قەمسەڵە و کراسی عەسکەری و نیوتاقت لەپشت بوایا کە ئەو کاتە لە لادێکان باوبوو، هەروەها شانە و ئاوێنە، تەزبیح، موکێش، هەرشتێ لە گیرفانت بوایا یان لە جلەکانتا بیاندۆزیایەتەوە دەیانبرد.

*** لەناو تۆپزاوا تێکەڵ خەڵکیتر کران، یان ئەو وەجبەیەی ئێوە هەر پێکەوە بوون.؟**

– بردمانیانە ساحەیەك هەمووەمان کراینە یەك کۆمەڵێ گەورە، لە چەند لایەکیشەوە کۆمەڵ کۆمەڵ خەڵك خڕ کرابوون. پێمانیان ووت کاتێ بانگ

کران کێ دەیەوێ پێکەوەبێت، پێکەوە وەرن بۆ ناونوسین. ئیتر نەماندەزانی چی بکەین لەلایەك حەزمان دەکرد تێکەڵ ئەو خەڵکەی ترمان بکەن تا هەرکەسە و هەواڵی کەسوکاری خۆی بزانێ و لە لایەکیش دەترساین ئەگەر تێکەڵ ئەو خەڵکە زۆرەی ترمان بکەن، لەیەکتر دابڕێین و دواتر بەر وەجبەی تر بکەوین و ئەم ناسیاو و کەسوکارەیەش کە پێکەوەین لە یەك دابڕێین. بە ڕاستی خۆشمان نەماندەزانی کامی باشترە، بە جیا بمانهێڵنەوە یان تێکەڵ ئەوانی ترمان بکەن. هەرچەندە مرۆڤ لە شوێنێ ترسناك بێت بەردەوام حەزدەکات دەوری قەرەباڵغ تربێت و تا زۆرترین ترسەکە کەمتر دەبێتەوە، بەڵام تۆپزاوا ئەوەندە ترسناك بوو ئێمە سڵمان لە هەردوکی دەکردەوە.

* بەجیا دایاننان.؟

- بەڵێ، ئەمووت براینە ساحەیەك و هەموومان کراینە کۆمەڵێ گەورە.

* کە دەڵێی هەموومان مەبەستت ئەوانەی ناو 21 نەفەرییەکەیە کە تۆی تیابوویت.؟

- نانا، مەبەستم ئەو وەجبەیەیە کە پێکەوە برابووین. کوورە ڕەنگە سەد سەیارە بووبێت، ئەو وەجبەیەی لە چەم ئالیاواوە بە قافڵەیەك

براینە چەمچەماڵ و لەوێوە بۆ تۆپزاوامانیان هێنا، هەموومان کراینە یەك کۆمەڵ.

*** لەوێش ئاولوس کرانەوە.؟**

– ئارەوەلا سەرلەنوێ ناومانیان نوسی و کەوتنەوە تەحقیقکردن.

*** هەر هەمان ئەو پرسیارانەیان لێتان دەکرد کە پێشتر لە چەم ئالیاوا و لە لیواکەی چەمچەماڵ لێتانیان پرسی بوو.؟**

– نەخێر، لێرە زۆر پرسیاری زیاتریان دەکرد.

*** وەکو چی.؟**

– لەوێ ناوتیان دەپرسی و موالید و خەڵکی کوێیت و چەکت پێ بووە یان نا، کارت چی بوو. بەلام لێرە پرسیاری هەموو شتێکی خۆت و کەسوکار و خزمت هەیە لەشار یان نا،ئەگەر ماڵە خزمێکت لە شار هەبوایا داوای ناونیشانی ئەویشیان دەکرد، پرسیاری ژن و منالّ و کەسوکارت لە کوێن، عەسکەریت کردووە، فێراربویت، چی مەسئولێکی پێشمەرگە دەناسیت، ئەگەر بتوتایا پێشمەرگەبووم پرسیاری مەفرەزەکەت و ناوی

مەسئول و شوێن و کاتی پێشمەرگایەتی و چەند شەڕ بەشدارت کردووە و ئەو شتانە.

*** تۆ چۆن وەڵامت دایەوە.؟**

– وەڵا ڕاست و ڕەوان ووتم من فیرار بووم و هێزی پشتگیری بوومە و چەکم پێ بووە کە تەسلیم بوومەتەوە. ژن و منداڵەکەشم چوون بەرەو قادرکەرەم و لەیەك دابڕاوین و باوەڕم وایە ئەوانیش گیراون و ڕەنگە لێرەبن. کاك حەبیب براشم ووتی من فەلاح بووم و هیچم لە هیچا نیە و لە قادرکەرەم دەستگیرکراوم، نە پێشمەرگە بووم و نە سەربازی فیرار.

*** خۆت و براکەت ناوەکانتان بە دوای یەکتریدا لەیەك سجل تۆمارکرا.؟**

– خۆی یەکەمجار وتیان کاتێ دەستدەکەین بە ناونوسین، کێ دەیەوێ پێکەوە ناوی بنوسرێت، پێکەوە وەرن، من و براکەم و یەك دوو ناسیاوی تر هەموومان پێکەوە ڕاوەستاین تا هەرچیەك دەبێت ئەگەر مردنیشە با پێکەوە بمرین. ئەوکاتەی بە ڕیز و بە دوای یەکتریدا بەرەو شوێنی ناونوسینەکە براین، هەر بە دوای یەکتریەوە بووین، براکەم لە من گەورەتربوو ئەو لە پێشەوە و منیش بەدوایدا نۆرەم گرتبوو، بەڵام کاتێ گەیشتینە ئەو شوێنەی ناویان دەنوسی، لەبەر ئەوەی لەیەك جێگە ناو

نانوسرا و چەند مێزێك دانرابوو بە تەنیشت یەكتریەوە و لە هەریەكیاندا زابتێك لە پشت مێزەكەوە دانیشتبوو كەسێكیش لە تەنیشتیەوە بوو بۆ (وەرگێڕان)ی قسەكان، ئیتر لە نزیك ئەو شوێنەی ناوەكانیان دەنوسی چەند عەسكەرێك وەستابوون و لە ریزەكەی ئێمە خەڵكەكەیان بە ریز دابەش دەكرد بەسەر مێزەكاندا، لەویَ كاتیَ حەبیب برام بەرەو مێزێك چوو بۆ ناونوسین و منیش بەدوایا رۆیشتم، یەكیَ لەو سەربازانەی بۆ رێكخستنی ئێمە راوەستابوون قۆڵمی گرت و خستمیە بەردەمی مێزێكی تر، لەویَ من جیاكرامەوە لەوان و بەر زابتێكی تر كەوتم بۆ تەحقیق، بەلاَم دوای ناونوسین و لێكۆڵینەوە جارێكی تر لە قاعەكان تێكەڵ كراینەوە.

*** دوای ئەوەی ناونوسكران، بۆكوێتانیان برد.؟**

– كۆمەڵیَ قاعەی زۆر زۆری لێبوو دەتووت دەواجینی مریشكە، نازانم شوێنی بەخێوكردنی مریشك بووە یان هەر خۆی مەعەسكەر و شتی وابوو یان تایبەت بۆ ئەم وەزعە دروستیان كردبوو، بەخوا دەتووت دەنك تەزبیحە بەرێك یەكەوە دروستكرابوون و هەر قاعەی بە مەزەنە رەنگە 500 بۆ 600 كەسیان تێكردبێت. ئیتر خەڵك هەبوو لەوكاتەی بۆ قاعەكان دەگوازراینەوە و كە دابەش دەكراینە سەر قاعەكاندا لەیەك بڕ دەبوون، هەبوون چەند برایەك پێكەوە یان كۆمەڵێك خزم و ناسیاو پێكەوەبوون بەلاَم لەوكاتەی بە ژمارە دابەشمانیان دەكرد بەسەر

قاعەکانا هەر یەکەیان بەر قاعەیەك دەکەوت. یان یەکێکیان لێیان دادەبڕا. بەتایبەت هەبوو منداڵ بوو برای بچوکت لەو شوێنە لەگەڵت بێت دەبێ لەخۆت زیاتر چاوت بەوەوە بێت، هەبوو لەو دابەشکردنەیا برا بچوکەکەی لێی جیاکرابوەوە زۆر ناخۆش بوو.

*** ئەوکاتەی باسی دەکەیت کاتەکەی کەی بوو.؟**

– پێشتر باسمکرد، شەو بوو.

*** بەڵێ ووتت شەو بوو گەیشتینە تۆپزاوا، بەڵام تا لە سەیارە دابەزێندران و برانە نێوو سەربازگەکە و تا تەفتیش و تەحقیق و ناونوسین تەواو بوو، بێگومان کاتێکی زۆری ویستووە، نازانی کەی بوو خستانیانە ناو قاعەکانەوە.؟**

– وەڵا سەعاتمان پێنەمابوو هەر لە تەفتیشەکە سەعاتیشیان لێمان سەند، نازانم سەعات چەند بوو، بەڵام رەنگە هەمووی هەر سەعاتێ دوای ئەوەی گەیەنراینە تۆپزاوا خرابێتینە قاعەکانەوە.

*** پێت وایە بە سەعاتێ ئەو هەموو خەڵکە ناونوس و تەفتیشکران.؟**

– ئەزانی چۆن بوو، خۆ هەموو ئەو خەڵکە لە یەك شوێن ناونوس ناکران، لە دەلاوە خەریکی تەفتیش و ناونوسین بوون. بۆیە رەنگە ئەو وەجبەیەی ئێمە هەر سەعاتێکی پێ چووبێت.

ئەوان زۆر پەلەبوون و بەخێرایی وەجبە لە دوای وەجبەیان بەرێدەکرد. ئەوکاتەی ئێمەیان دەبرد بەرەو قاعەکان، لەولاوە دەتبینی وا وەجبەی تر لە قاعەوە سواری سەیارە دەکەن. لە دەرەوەی سیمبەندەکە سەیارەی تر وەستاوە بە نەفەرەوە و چاوەڕێیەتی نۆرەی بەرکەوێت بێتە ژوورەوە خەڵك دابگرێت، بڕوا بکە ئێستا هەندێ گەراجی سەیارە دەبینیت لەیەك کاتدا لەچەند لاوە سەیارە نەفەر باردەکات و لەولاوە سەیارەی تر نەفەر دادەگرێت و ریزێك سەیارە بەنەفەرەوە دەڕواتە دەرەوە و ریزێك دێتە ژورەوە، ئەو تۆپزاوایە ئەو شەوە ئاوهابوو، سەیارەی بووك چۆن بوو بەدوای یەکتریەوە ریزیان دەبەست، لێرە ئاوا بەدوای یەکترییەوە سەیارە دەهات و دەچوو، هەمووشی ژن و منداڵ و گەنجی کوردی پێبوو.

* کەش و هەوا چۆن بوو.؟

– یەعنی چۆن.؟

*** مەبەستم ئەوەیە ئەو شەوە هەور بوو باران بوو، ئاسمان سامالّ بوو، سارد بوو، گەرم بوو.؟**

– خۆی ساڵ درەنگ بوو، حسابکە بەهاربوو. چونکە بیست رۆژ زیاتر بوو نەورۆزمان کردبوو، بەڵام هەوری هەبوو، سەرماش بوو، وە بۆ بەیانی ئەوکاتەی ئێمەیان لەوێ گواستەوە باران دەباری.

*** ئەوکاتەی کرانە قاعەکانەوە، خەڵکی تری تیابوو.؟**

– پێش ئێمە لەوە ئەچوو وەجبەی تری تیا بووبێت، چونکە پیسی و پاشەڕۆ و ئەو شتانەی تیابوو، بەڵام رەنگە ئەوانیش بۆ شوێنی تر گواسترابێتنەوە، ئەوکاتەی ئێمەیان بردە ناو قاعەکەوە چۆڵ بوو.

*** دەبوو پێشتر پرسیارم بکردایا، تۆ لە پێش نیوەڕۆوە گەیشتیتە چەم ئالیاوا و وا ئێستا نیووە شەوە، نیوەڕۆ و ئێوارە هیچتان خوارد.؟**

– ئێمە کە چووینە چەم ئالیاوا لە قادرکەرەم خۆمان نانمان پێبوو، ئەو خەڵکەش هەمووی هەر لە گیرفان و بەرباخەڵی بەشی ئەوە نانە وشکەی پێبوو تا برسی نەبێت، بەدەم رێگەوە و تا گەیاندمانیانە تۆپزاوا، ئەگەر

یەکێ برسیبوایا لەتە نانێکی دەخوارد، بەڵام کە تەفتیش کراین لە تۆپزاوا هیچ شتێکیان پێمان نەهێشت، لە گیرفانت یان بەر باخەڵت گوێچکە نانێکی تیابوایا ئەویشیان لێت دەسەند، تەنانەت هەویێ (جنسیە نفوس) و پارە و مەگەر یەکێ شتێکی لەشوێنێکا شاردبێتەوە نەیاندۆزیبێتەوە، ئەگینا هیچیان پێمان نەهێشت. شەویش درەنگانێك هەندێ سەموونە رەقیان هەڵدایە قاعەکەوە ئەو خەڵکە هەمووی پەلاماری دەدا، باوەڕ ناکەم لە دەکەس یەکێ سەمونێکی دەست کەوتبێت. بەشێکی تیابوو زۆر هیلاك و برسی و تینوو بوو. چونکە چەند رۆژێکیش بوو هەر نانە وشکە و ئاومان خواردبوو شتێك نەبوو تاقەیەکت بداتێ بۆیە زوو زوو برسیمان دەبوو. ئەو شەوە تابەیانی زۆرێکی هات و هاواری بوو لە تینوان و لە برسا. لەوەش ناخۆشتر و ناڕەحەتتر چوونە سەرئاو بوو، بە زەحمەت رێگەیان دەدا کەسێ بچێتە سەرئاو، ئێمە حسابکە لە پێش عەسرەوە لەناو سەیارە بووین و تەواو سەغڵەت بووین، بەعەمرخوا ئەگەر بترسی ئەوە زوو زوو میزت دێت، ئەو خەڵکەش هەر سەعاتێکت مردنێ بوو ترس و لەرزێ بوو مەپرسە، بۆیە زۆرتر هیلاکی میزکردن بووین وەك لەنان و ئاو.

*** چەند کەس دەبوون ئەو وەجبەیەی خرانە ناو قاعەکەوە.؟**

– وەڵا بە ژمارە نازانم، چونکە هەر ئەوکاتەی ئێمەیان بردە ناو قاعەکە کۆمەڵێ گەنجی تریشیان هێنا وابزانم ئەوانیان لە چەند قاعەیەکی ترەوە گواستبۆوە بۆ ئەوێ، لەوەش ئەچوو ئەوان پێشتر لە تۆپزاوا بووبێتن. بەڵام بە ئێمەو ئەوان ئەوەنە زۆربووین رێگە نەبوو دانیشین هەر بەپێوە وەستابووین.

*** مەبەستت چیە لەوەی ئەوان پێشتر لە تۆپزاوا بوون.؟**

– مەبەستم ئەوەیە لەوە ئەچوو ئەوان وەك ئێمە ئەو رۆژە نەبرابێتن بۆ تۆپزاوا، چونکە کاتێ پێکەوە قسەمان دەکرد هەبوو دەیووت سێ چوار شەوە لێرەین، دیاربوو ئەوان پێشتر دەستگیر کرابوون و ئیتر قسمەت و نسیبمان کەوتبووە یەك.

*** ئەوان خەڵکی چی ناوچەیەك بوون.؟**

– هەر خەڵك ناوچەی گەرمیان بوون.

*** تۆ هیچ کەسێکت لەوێ بینی کە پێشتر یەکتریتان ناسیبێت.؟**

– وەڵا خۆی لە راستیا چونکە من چەند ساڵێك بوو لە کەرکوك کرێکاریم دەکرد، کەمێك دوور کەوتبوومەوە لە گوندەکان، ئەو چەند

ساڵەش کە سەربازی فیرار بووم بە دەم و چاو زۆر کەسم دەناسیەوە کە پێشتر بینیوومن و دەمزانی خەڵکی گوندەکانی دەوروبەرمانن یان پێشمەرگە بوون لە ناوچەکە، بەڵام بەخوا بەناو نازانم بڵێم بە دیاریکراوی کێ لەو قاعەیە بوو کە پێشتر ناسیبێتم یان بڵێم برادەر بووین.

*** هەستت بەچی دەکرد، کاتێ ئێوە ژمارەیەکی گەنج جیاکراونەتەوە لە قاعەیەک و لە چەند قاعەیەکی تریشەوە کۆمەڵێک گەنجی تریان هێناوە، باوەڕت وابوو بۆچی ئامادەتان دەکەن.؟**

– قەناعەتی ئێستای خۆم یان بیرکردنەوەی ئێستام لەو وەزعە جیاوازە لەوەی ئەوکاتە کە لەناو قاعەکە بووم چۆن بیرم دەکردەوە، ئەتوانم بڵێم بیرم لە زۆر شت دەکردەوە، تەنانەت لەوەش کە ڕەنگە بمانکوژن، بەڵام بەهیچ شێوەیەك ئەوە بە خەیاڵمدا نەدەهات کە بەو دەردەمان بەرن کە ڕوویدا. ئەو شەوەی کە یەکەم شەو و دواین شەوم بوو لە تۆپزاوا بۆ من زۆر بە ئازار بوو، بەتایبەت کە من تا پێش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە لەو هەردەو هەڵەتانەی ناوچەی قادرکەرەم بووم و لەگەڵ خۆتەسلیم کردنمان و پاش چەند سەعاتێك خۆمم لەو شوێنە بینیەوە، دەمووت ئەم حکومەتە نیازی خراپە لەگەڵمان، ڕەنگە هەموومان لە زیندان بهێڵێتەوە و مەحکەمەمان

بکات و ڕەنگە ئیعدامیشمان بکات، ئەو هەموو ژن و منالە هەمووی بخاتە سجنەوە. بەڵام کێ دەیزانی لە جیاتی سجن هەموومان دەخاتە ناو گۆڕی بەکۆمەڵەوە.

شەوێکی ناخۆش بوو، خەم لە خۆم لە براکەم، خەم لە ژن و منالەکانم، خەم لە دایك و براکانی ترم. نازانم ئەمووت خۆزگە هەر لە ئاواییەکانی خۆمان هەموومانیان بکوشتایا خۆشتربوو لەوەی ئاوا خراوینەتە ڕەزالەتەوە، بیرم ئەکردەوە باشە خۆ حکومەت ئەگەر بەتەمایە بمانکوژێت دەیتوانی لە ناوچەکانی خۆمان کیمیایی بکات بەسەرماندا، هیچ نەبێت کە بەیانی لە چەم ئالیاوا تەسلیم بووین دەیتوانی لەوێ هەموو ئەو خەڵکە ڕەمی بکات. باشە ئەگەر نیازی کوشتنی ئەو هەموو خەڵکەی هەبوو ئەی بۆچی لە ناوچەکانی خۆمان نەیکوشتین، بەوە دڵی خۆمم ئەدایەوە دیارە هەر بۆ ماوەیەك سجنمان دەکەن و بزانە تەحقیقی چی دەکەن و دواتر ئازادمان دەکەن. کاتێ بەچاو خۆیشم دەمبینی سەدان سەیارە بە ژن و منالەوە دەهێنران و دەخرانە قاعەی جیاجیاوە و لەلایەکی ترەوە پەیتا پەیتا خەڵکیان باردەکرد و دەیانگواستەوە، نەت دەتوانی قەناعەتت لەسەر شتێك جێگیر بکەیت و یەکجار یان باوەڕت بەوە بێت دەمانکوژن، یان باوەڕت وابێت دەمانبەن بۆ سجنی تر. لەیەك سەعاتدا دەجار بیروڕات دەگۆڕی. ئیتر بەو حاڵەوە ئەو شەوەمان بردەسەر و تا خوا ڕۆژی کردەوە ئەو خەڵکە

هەمووی هەر بەپێوەو هەریەکی شتێکی دەوت. هەبوو دەگریا بۆ کەسوکاری، بۆ ژن و منالّی بۆ بەدبەختی کورد. ئیتر مەگەر رۆژی حەشر وابێت وەك باسی دەکەن.

دەمەویەیان کۆمەڵێك سەیارەیان هێنایە بەردەم قاعەکەمان لەوە ئەچوو بۆ گواستنەوەی ئێمە هاتبێتن و رەنگە دوایی بڕیارەکە گۆڕابێت چونکە سەیارەکان راگیران و ئیتر کەس بەلامانا نەهات و هیچ رووی نەدا، سەرەتا هەموومان پێمان وابوو ئەوە وەك ئەو دەیان قاعەیەی تر کە بە بەرچاوی ئێمەوە دەخرانە سەیارەوە و کەس نەیدەزانی بۆکوێ دەبران، ئەوە نۆرەی ئێمەش هات، بەڵام کە سەیارەکان لەبەردەم قاعەکەی ئێمە راوەستان و هیچ رووی نەدا، لە روخساری هەموومانداا ئومێدێکت دەبینی رەنگە عافواتی دابێت، یان خوا هاتبێتە جواب لەسەرمان، شتێك رووی دابێت وا ئێمەیان نەگواستەوە. بەڵام کە لە پەنجەرەکانەوە دەمانبینی هەر خەڵکی تر دەهێنرانە ناو سیمبەندەکەوە و کۆمەڵ کۆمەڵ دەخرانە سەیارەی ترەوە، هەمان ترس و نائومێدی دەمانیگرتەوە و ئیتر هەموومان چاوەڕێی ئەوەبووین دەرگاکە بکرێتەوە و بمانبەن بۆ شوێنی خراپتر. هەرچەندە ناو ئەو قاعەیە زۆر ناخۆش بوو، 500 بۆ 600 کەس خرابوینە قاعەیەکەوە هەر لە گەرما خەریك بوو بتاسێین، لە دەرەوە هەورو هەڵاو باران بوو، بەڵام ناو قاعەکە هەناسەی تیا نەمابوو، لەسەرێکەوە ئەمانووت بمانگوێزنەوە بۆ شوێنێکی تر باشترە و هیچ نەبێ کە دەرگاکە دەکەنەوە هەنێ هەوای پاك هەڵدەمژین.

*** تا کەی دەرگایان لەسەر نەکردنەوە.؟**

– هەر ئەو شەوەبوو، بەیانی خۆروبان کەوتبوو هاتن دەرگاکەیان کردەوە و کەوتنە بارکردنمان.

*** تۆ پێشتر ووتت باران بوو، ئێستاش دەڵێی خۆروبان کەوتبوو مەبەستت لەوەیە رۆژ بووبووەوە.؟**

– نانا، هەر خۆر دەرکەوت. زۆرجار لە بەھاردا خۆریش دیارەو بارانیش دەبارێت ئەو رۆژەیش وابوو، خۆر کەوتبووە ئاسمان و بارانیش بوو، ناو قاعەکە زۆر زۆر گەرم بوون، دەرەوەیش زۆر سارد بوو.

*** سەعات چەند بوو، کە دەرگایان لەسەرتان کردەوە.؟**

– وەڵا بەتەواوی نازانم سەعات چەند بوو، بەڵام خۆر بەرز بوو.

*** کە دەرگاکەیان کردەوە چیت بینی.؟**

– چیم بینی، نازانم ئێمە لەناو قاعەکە بووین هەر ناو تۆپزاوامان لێوە دیاربوو.

*** دەرگایان کردەوە و ئێوەیان بانگ کردە دەرەوە.؟**

– نەخێر خۆیان هاتنە ژوورەوە و نازانم ئێستا لە بیرم نیە بڵێم یەکە یەکە خەڵکەکەیان ئەژمارد، یان هەروا بە هەڕەمەکی هەر جارەو کۆمەڵێکیان ئەبردە دەرەوە. بەڵام بەگوێرەی ئەوەی ئەو کۆمەڵەی ئێمە کە پێکەوە براینە دەرەوەی قاعەکەو خراینە ناو سەیارەیەکەوە رێك پڕ سەیارەکە بووین نە زیاد و نە کەم، بۆیە ئەڵێم رەنگە ئەوان خۆیان ئەوەیان زانیبێت هەر سەیارەی چەند کەس دەگرێت و لەوە دەچێت هەر کۆمەڵێك بەقەدەر ناو سەیارەیەیەك بووبێت.

*** تۆ کەی لە قاعەکە برایتە دەرەوە.؟**

– ئەی باسی چی دەکەم، ناڵێم خۆر بەرزبوو بە ئاسمانەوە.

*** مەبەستم ئەوەیە کاتێ کۆمەڵ کۆمەڵ دەخرانە سەیارەوە، تۆ بەر چی کۆمەڵێک کەوتیت.؟**

– ئا، وەڵا بۆ نەگبەتی یەکەم وەجبە بەری کەوتم. ئەویش بەهۆی ئەوەی لەناو قاعەکە دڵم ئەوەنە سەغڵەت بوو ئەوەنە تەنگە نەفەس بووبووم هاتبوومە نزیکی دەرگاکە ئەمووت ئەگەر دەرگاکەیان لێمان کردەوە با زوو کەمێك هەوای پاك هەڵمژم، بۆیە بەر یەکەم وەجبە کەوتم.

*** ئەی براکەت، هەر لەگەڵ خۆت پێکەوە بەر ئەو وەجبەیە کەوتن.؟**

– ناوەڵا، لەوێ لەیەکتر دابڕاین، ئیتر نازانم ئەو چی بەسەر هات. دوای ئێمە خرایە ئەو سەیارانەوە، بۆ شوێنی تر نێردران، هەر لە قاعەکە مایەوە، تا ئێستا هیچ لەبارەیەوە نازانم.

*** چۆن کردتانیانە دەرەوەی قاعەکە بەرەو سەیارەکان، هەروا بەکۆمەڵی وەک لە قاعەکە کۆمەڵ کران یاخوود بەدوای یەکتریدا ریزکران بۆ ناو سەیارەکە.؟**

– ئەزانی چۆن بوو ئەوان لەناو قاعەکە ئەو کاتەی کۆمەڵێکمانیان جیاکردەوە لەوە ئەچوو ئێمەیان ژماردبێت بەڵام ئێمە هەستمان پێنەکرد بە ژمارە جیامان بکەنەوە چونکە رێك بەقەدەر ژمارەی کورسیەکانی سەیارەکە بووین، کاتێ بەکۆمەڵی لەبەردەم دەرگاکە خڕکراین پێمانیان ووت ریزبن و بەدوای یەکتریدا بڕۆن، ئاوا دەستیان بۆ سەیارەکە درێژکرد. سەیارەکان زۆر دوور نەبوون لە دەرگای قاعەکەوە رەنگە هەروا بیست مەترێك دوور بووبێت، لەنێوان دەرگای قاعەکە بۆ سەیارەکەش هەمووی پڕی سەرباز بوو، کلاشینکۆفەکانیان بەدەستیانەوە و ئامادە وەستابوون

وەك بلێی وریای ئەوە بوون نەك ئێمە بمانەوێ رابکەین یان شتێ، چونکە دەتووت لە ناو جەبهەدان هەموویان قایشی تفەنگەکانیان کردبووە ملیان و تفەنگەکانیان بەدەستەوە و روویان کردبوو لە ئێمە و پەنجەیان لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگەکانیان بوو. بە تورەییەوە پێمانیان دەوت سەرداخەن، نابوو تەماشای ئەملاو ئەولاش بکەیت و دەبوو مل بخەوێنی تا ناو دەرگای سەیارەکە.

***   دەست و چاویان نەبەستن ئەوکاتەی بۆ ناو سەیارەکان بردتانیان.؟**

- نەخێر.

***   جۆری سەیارەکان چی بوون.؟**

- وەڵا باش بوو ئەو پرسیارەت کرد، سەیارەکان نەوعێك بوو من تا ئەوکاتە سەیارەی لەو جۆرەم نەبینی بوو، چەند ساڵ لە کەرکوك کرێکاریم کردبوو چەند جارێك بەغداشم بینی بوو، هیچ کاتێك سەیارەیەکی لەو جۆرەم بەرچاو نەکەوتبوو، خۆ لەم ساڵانەی دوای تەلەفزیۆنیش پەیابوو تەنانەت لە فلیمیشدا سەیارەی وام نەدیووە، ئەوە چەند ساڵیشە من لە ئەمریکام لەوێش لەو سەیارانەی لێ نیە. لەوە

ئەچوو هەر بۆ ئەوە دروستیان کردبێت ئەنفالەکانی پێبگوازنەوە و دوای رەنگە سەیارەکانیان سوتاندبێت، چونکە ئەوە چەند ساڵە ئەنفال بووە، تا ئێستا یەکێ لەو سەیارانەمان نەبینیەوە.

*** پێت لە ووتم چی جۆرێک بوو.؟**

– لە راستیا شێوەی بە ئیسعافی خەستەخانە دەچوو، بەلام ئیسعافیش نەبوو. رەنگی سپی بوو وەك سەیارەی (پۆڵەنی) چۆنە ئاوا بەلام پانتر و درێژتر و کەمێك نزمتر بوو. دەرگایەکی هەبوو بۆ سایەقەکە و لەلای راستیشەوە یەك دەرگایە بچوکی هەبوو بەخوا رەنگە هەر پەنجا شەست سانتیمێك بوایا سکە بوو، کە دەچویتە ناو ئەو دەرگایەشەوە شوێنێکی بچووك بوو دەکەوتە پشتی سایەقەکە و لەناو ئەوەوە دەرگایەکی تری هەبوو بۆ ناو سەیارەکە، لە ناوەوەیش کورسیەکان ریز ریز بە دوای یەکترییەوە بوون ئەها ئێستا لە قاعەی حەفلەو شتی وایا دەیبینی کورسیەکان بە دوای یەکترییەوەن، ئاوها بوو. وابزانم هەر ریزی پێنج کورسی بوو ئەگەر غەڵەتیش نەبم حەوت ریزبوو، ئا چونکە ئێمەیش ئەو کۆمەڵەی یەکەمجار جیاکراینەوە 35 کەس بووین.

ئیتر نەپەنجەرەی هەبوو نە شوێنی نەفەسێ، هەر ئەتووت بۆ ئەوە دروستیان کردووە ئەو خەڵکەی تیا بخنکێنن. ئەگەر هەرکەسێك پێشتر

لای وابوو‌بێت ڕەنگە بەرمان بدەن یان هەر ماوەیەك بە سجنی بمانهێڵنەوە، کاتێ خراینە ناو ئەو سەیارەیەوە ئیتر باوەڕناکەم کەسێك هەبووبێت جارێکیتر بە تەمای ژیان مابێت. شەوی پێشوو ئێمە لەناو قاعەکە خەریك بوو بتاسێین و خواخوامان بوو بمانگوێزنەوە بۆ شوێنێکی تر و ئەمووت باوەڕ ناکەم حکومەت شوێنی لەوە خراپتری هەبێت، بەڵام ناو ئەو سەیارەیە وەك ئەوە وابوو بتخەنە ناو سنوقێکی ئاسنەوە و کەپسی بکەن، ئیتر وورده وورده هەوا نامێنێ هەڵیمژیت و خۆت دەمریت. بەخوا لە ئەو دەرگایەی ناوەوە کە ووتم دەکەوتە نێوان ئێمەو بۆشاییەکەی پشتی سایەقەکەوە ئەوە چوارگۆشەیە بچوکی تیابوو بە شیش خانەخانە کرابوو دەستی ناخوارد، ئەگەر ئەو کوونە لەویا نەبوایا بڕوا بکە هەر لەناو سەیارەکە بە دە دەقە هەموومان دەمردین.

*** هیچ کەسێکی ناسیارت لەگەڵ بوو لەناو سەیارەکە؟**

– پێشتریش ووتم کە بەشێکیانم بە دەم و چاو دەناسی و دەمزانی خەڵکی ناوچەکەی خۆمانن بەڵام بەناو نەمدەزانی ناویان چیە، لەناو سەیارەکەیش ڕەنگە بڵێم شەش بۆ حەوت کەسێکی دەمزانی جاری تریش لە گوندەکانی ناوچەکەی خۆمان بینیوومن. تەنها یەك کوڕێکم دەناسی ناوی کاك ئەنوەر تەیار بوو، پێشمەرگە بوو لای مەحمود سەنگاوی و پێشتر هاتوچۆی ماڵمانی کردبوو، ئەویش وەك ئەو خەڵکە دەستگیر

کرابوو، لەناو سەیارەکەی ئێمە بوو. بەڵام هەستم دەکرد زۆرێك لەوانەی ناو سەیارەکە کاك ئەنوەریان دەناسی، ئیتر نازانم ئەوانیش بەهۆی پێشمەرگایەتییەوە ناسیبویان یان نا، بەڵام دیار بوو وەك دۆست و نسیاو مامەڵەی لەگەڵ زۆرێکیان دەکرد.

*** کاتێ خستانیانە ناو سەیارەکەوە لەوەندەی هەستت پێکرد، پێش ئێوە کەسیتر بەو سەیارانە گوێزرابوونەوە.؟**

– ئەو شەوەی لە قاعەکە بووین تا بەیانی خەڵکیان دەگواستەوە، ئەگەر بڵێم بەچاو خۆم بینیم بەو سەیارانە خەڵکیان گوێزابێتەوە، نەمبینیووە. چونکە سەیارەکانی شەو لە جۆری تر بوون. بەڵام کاتێ خراینە ناو سەیارەکەوە، بەڵێ لەوێ زانیمان پێش ئێمە ئەم سەیارەیە وەجبەی تری گواستۆتەوە.

*** بەچی زانیتان.؟**

– ناو سەیارەکە پاشەڕۆی ئینسانی تیابوو، هێشتا هەر تەڕ بوو. بەوەیا زانیمان و لە ڕێگەیش یەك دوانێ لە سجنەکان ووتیان ئەوە لە کوشنەکە بە کوردی نوسراوە (بردمانیان بۆ حدود ئوردن، بردمانیان بۆ حدود سعودیە).

*** پێشتر ووتت کە لە تەفتیشەکە هەمووشتێکیان لێمانسەند، قەڵەمیان لەکوێ بوو، وا ئەو زانیاریانەیان لە کوشنی سەیارەکە تۆمار کردبوو.؟**

– من ئەوە نازانم، لە وەجبەکەی ئێمە کەس قەڵەمی پێنەبوو ئێمەش نەمان نوسی، کە سواری سەیارەکە بووین لە کوشنەکە وا نوسرابوو، ئیتر ئەوانەی پێش ئێمە چۆن ئەوەیان نوسیووە و قەڵەمیان لە کوێ بووە، ئەوەیان من نایزانم.

*** باسی ئەوەتکرد لە نێوان ئێوە و شۆفێری سەیارەکە بۆشاییەك هەبووە لە نێوان ئێوەو ئەو بۆشاییە دەرگا هەبووە، نەتانزانی ئەوە بۆچی بووە.؟**

– با، چۆن نەمانزانی، ئەوە شوێنی حەرەسەکەمان بوو.

*** حەرەستان هەبوو.؟**

– بەڵێ دوای ئەوەی ئێمەیان سەرخست و دەرگاکەیان لەسەرمان کلۆمدا، عەسکەرێك هاتە ئەو بۆشاییەی نێوان ئێمە و سایەقەکەوە.

*** چی جۆرە چەکێکی پێبوو.؟**

- کلاشینکۆف.

*** جلەکەی لە بەری بوو، چی بوو.؟**

- ئەی نالێم عەسکەر بوو، خۆ قابیلە عەسکەر جل مەدەنی ناکاتە بەری.

*** مەبەستم لە رەنگی جلەکەی بەری بوو.؟**

- ئا، وەڵا مغاویری سەوز بوو، ئەها بەڵەك بەڵەکە.

*** کاتێ هەموتان خرانە ناو سەیارەکەوە و دمرگایان لە سەر داخستن، سەیارەکە هەر لە شوێنی خۆی راوەستا، یان کەوتە رێ.؟**

- کەمێك رۆیشت رەنگە هەروا چەند سەد مەترێك دەبوو، پاشان بۆ ماوەیەکی زۆر راوەستا.

*** نەتانزانی بەهۆی چییەوە کەمێك رۆیشت و پاشان راوەستا.؟**

- کورد ئەڵێ ئەگەر کەسێك بکەوێتە ناو دەریاوە دەست بۆ پوشی سەر ئاوەکە دەبات بۆ رزگار بوون، ئێمەیش هەرچەندە تەواو دڵنیابووین ئیتر

چاومان بە دونیای رۆشن ناکەوێتەوە، بەڵام چونکە ژیانمان خۆش دەویست و دەمانویست بمێنین، بۆیە زوو ئەو خەیاڵەمان بۆ خۆمان دروست دەکرد کە پشت بە خوا رزگارمان دەبێت.

سەرەتا کە سەیارەکە کەوتە رێ هەر کەسە و لەلای خۆیەوە کەوتە شایەتمان هێنان و ووتمان ئەوە بەرەو مەرگ بەرێمان دەکەن، بەڵام کە بۆ ماوەیەك راوەستا، دڵمان بەوە خۆش بوو ئەمانووت رەنگە پەشیمان بووبێتنەوە لەوەی بمانبەن بۆ مردن، یان رەنگە خوا بە هانامانەوە هاتبێت و عافواتێ شتێکی دابێت. بەڵام ئەو دەرگایەی لەسەر ئێمەیان داخستبوو چوارگۆشەیەکی بچوك کە بە شیش خانەخانە کرابوو کەوتبووە نێوان ئێمە و ئەو بۆشاییەی پشتی سایەقەکەوە، لە نێوان ئەو بۆشایەو سایەقەکەش شوشەیەك هەبوو وەك پەنجەرە، لەوێوە ئەگەر بە ووردی تەماشات بکردایا دەرەوەت لێوە دیاربوو، نازانم ئەو کاك ئەنوەر تەیارە بوو یان یەکێ لە سجنەکانی تر بوو لەوێوە سەیری دەرەوەی دەکرد، زوو ئەو ئومێد و خەیاڵەی بەتاڵ کردینەوە کە دەمان ووت رەنگە پەشیمان بووبێتنەوە لەوەی بمانبەن، ئەو ووتی ئەوە بۆیە لێرە رایانگرتووین تا سەیارەکانی تریش پڕ دەکەن و وا یەکە یەکە دێنە ریزەوە.

بەوەیا زانیمان ئەو راوەستانە بۆ ئەوە بوو تا هەموو زیندانیەکانی تر ئەوەی لەگەڵ ئێمە لە قاعەکە بوون دەخرێنە ناو سەیارەکانەوە و هەرکات هەموویان حازر بوون ئەوکات بە قافڵە بەرێمان دەخەن.

* **تۆ خۆت ئەو کاتە لەو بۆشاییەوە تەماشاتکرد.؟**

– نەخێر، ناڵێم یان کاک ئەنوەر بوو یان یەکێ لە سجنەکانی تر بوو، بەڵام دەزانم هەر لەو ریزەی کورسیەکە بوو کە ئێمە پێکەوە لەسەری دانیشتبووین، چونکە ریزی پێنج کەس بووین ئەو کاک ئەنوەرە لە تەنیشتی منەوە بوو لەودیوو ئەویشەوە سێ کەسیتر هەبوون.

* **ئەو کاتەی تەواو ئامادە کران و سەیارەکان خرانەڕێ، نازانی کاتەکەی کەی بوو.؟**

– بەیانی بوو.

* **دەزانم بەیانی بوو، مەبەستم لەوەیە سەعات چەند بوو.؟**

– راستیەکەی بۆ سەعات نازانم، بەڵام دەمێك بوو خۆروبان کەوتبوو.

* **پێشترووتت کە راوەستا ئومێدێکم لا دروست بوو کە رەنگە خوا بە فریامان کەوتبێت، ئەی ئەمجارە کە تێگەیشتی لەوەی**

**راوەستانەکە بۆ ئەوە بوو تا هاوڕێکانی تریشتان بهێننە ریزەوە و پێکەوە بەرەو چارەنوسێکی نادیارتان بەرن، ئەمجارە هەستت چۆن بوو.؟**

- نیتر تەواو هیچ ئومێدێکمان نەما و ئەوە دووا ساتەکانی ژیانمان بوو، خەڵك ئەگەر بزانێ پاش چەند رۆژێك یان پاش چەند سەعاتێکی تر دەمرێت ئەگەر شوێنەکەی وەك بەهەشتیش بێت و لەناو کەسوکار و خۆشەویستانی خۆشیا بێت هەر هەست بە نائارامی و دڵتەنگی دەکات. ئێمە ئێستا لەناو سەیارەیەکی سەرداپۆشراوداین نەك پەنجەرەیەکی تیا نیە دەرەوەی خۆمان ببینین، تەنانەت هەوای تیا نیە هەڵیمژین، هیچ هەواڵی کەسوکار و ژن و منداڵ و خۆشەویستانمان نازانی و باوەڕمان وابوو رەنگە ئەوانیش بە هەمان ئەم دەردەی ئێمە چووبن، ئیتر ئەبێ لە حاڵەتێکی وادا هەست بەچی بکەیت.

ئەگەر هیچ گومانێکت نەبووبێت لەوەی کە حکومەت نیازی خراپە لەگەڵمان، یان ئەگەر ئێمە سجنیش نەبوایاین، بەڵام کاتێ خراینە ناو ئەو سەیارەیەوە و بەو جۆرە بۆ هەر شوێنێکت بەرن، هەر دەبێ چاوەڕێی مردن بکەیت. چونکە ناو سەیارەکە وەك قەبر وابوو بەڵام هەرخۆت لە قەبرەکەیا نەبوویت دەتبینی وا کۆمەڵێ خەڵکی تر وەك تۆ لەناو ئەو

قەبرەدان، ڕێك هەر لە قەبر دەچوو. من نازانم ئەبێ چی شتێك هەبێ لەوە بە ئازارتر بێت چاوەڕێی مردن بکەیت، ژیانت هەرچەند ناخۆش بێت، چەند بیزاربیت لە ژیان، چەند ئەگەر بڵێی حەز لە مردن دەکەم و مردن بە ڕزگار بوون بزانیت، بەڵام کاتێ تەواو دڵنیا بوویت وا لێی نزیك دەبیتەوە، لێی دەترسیت. ئێمە لەو حاڵەتی ترسەدا بووین چونکە دەمانزانی بە ئازارێکی زۆرەوە بەرەو مردنمان دەبەن.

هەر ئەو کاتەی سواری سەیارەکەیان کردین، تیامانا هەبوو تینوو برسی بوو. هەبوو تەنگاو بوو خەریك بوو میز بەخۆماندا بکەین. ناو ئەو سەیارەیە تەنگەنەفەسیەکەی و ترس و نائومێدیەکەش ئەوەندەی تر قوڕگی وشك کردبووین، هەر خەریك بوو دەخنکاین، خەریك بوو لەگەرما بتاسێین.

سەرەتا کە سواری سەیارەکە کراین، ئەو بۆن و بەرامە پیسەی ناوی خەریك بوو ڕۆحمان دەرکات، میزو پیسی پاشەڕۆی ئەو خەڵکانەی پێشتر بەو سەیارەیە گوێزرابوونەوە. بەڵام لە ڕێگە ئەوەندە تینوو برسی بووین، ئەوەندە دەم و لێومان و قوڕگمان وشك بوو، خوا عەلیمە دەممان دەخستە سەر تەڕیی ئەو میزو پیسییە تا کەمێك فێنکی بگاتە دەممان. خۆی لە ڕاستیا ناو سەیارەکە زۆر گەرم بوو، بەڵام بەهۆی ئەوەی هەوا لەژێر سەیارەکەی ئەدا ئەو شوێنەی تەڕبوو لەچاو ناو گەرمی سەیارەکەوە ئەو فێنك بوو. کورە بەخوا لە تینوا زۆربەمان میزەکەی خۆمان دەکردە ناو پێڵاوەکانمانەوە و لە جیاتی ئاو دەمانخواردەوە،

هەبوو پێڵاوەکەی لاسیق بوو ئەوە باش بوو میزەکەی دەگرتەخۆی بۆ ئەو شوێنە وەك پەرداخ وابوو، بەڵام هەبوو پێلاوەکانی ئەدیداس بوو کە میزەکەی تێدەکرد پێڵاوەکە هەڵیدەمژی. وەرە ئەو دیمەنە ببینە لە تینوا بتەوێ میزەکەی خۆت بخۆیتەوە بەڵام خوا ئەویشت بە قسمەت نەکات.

***    وەك لە وەسفکردنی سەیارەکەدا باستکرد، ئەو شوێنەی سەربازە پاسەوانەکەی ئێوەی لێبوو دەکەوتە نێوان ئێوە و شۆفێرەکەوە، وەك باستکرد ئەو لە چوارگۆشەیەکی بچوکدا بووە و ئەویش وەك ئێوە دەرگای لەسەر داخراوە، هەستتان دەکرد ئەویش وەك ئێوە کەوتبێتە هیلاکەتەوە.؟**

–    راست دەکەی شوێنەکەی ئەویش ئاوا بەرتەنگ بوو، بەڵام زۆر سەیر بوو ئەو لەسەرو سیماو روخساریا دیاربوو کە گەرمای نیە، لەوە ئەچوو لە ژێر سەقفی سەیارەکەوە شوێنی هەبووبێت تا هەوای بۆ هاتبێت، چونکە ئەو بۆشاییە بچوکەی نێوان ئێمە و ئەو کاتێ لەوێوە تەماشات دەکرد تا لە شووشەی لای سایەقەکەوە شتێك ببینی هەوایەکی فێنکی لێوە دەهات، چەنێك دەمانویست لەوێوە شتێ لە دەرەوە حاڵی بین دوو ئەوەنە زیاتر دەمانویست کەمێك ئەو هەوا فێنکە بەر سەروچاومان بکەوێت.

***    کەس لەو بۆشاییەوە قسەی لەگەڵ سەربازەکە نەکرد، لێی بپرسن بۆ کوێتان دەبەن، یان هەر پرسیارێکی تر.؟**

– بەروەڵا پرسیاریان لێی دەکرد، بەڵام وەڵامی نادایەوە، یەك جارێك نازانم یەکێ لە سجنەکان بینیبووی وا ئاو دەخواتەوە وابزانم داوای ئاوی لێکردبوو، وتیان دەڵێ تەحەمولتان هەبێ ئەو شوێنەی بۆتان دانراوە هەموو شتێکی لێیە.

***    باوەڕتان بە قسەکەی هەبوو.؟**

– باوەڕی چیمان پێی هەبێت، جا ئەگەر راستیش بوایا بە ئێمە چی، ئێمە لە ناو ئەو سەیارەیە هەموومان وەك هارو شێتمان لێهات لە تینوا و لە گەرما، ئەگەر بەو جۆرە بۆ بەهەشتیشت بەرن بەهشت هیچ مانایەکی نامێنێ بۆت.

***    لە تۆپزاوا تا ئەو شوێنەی بۆ گوللەبارانکردن ئامادە کرابوو، لە هیچ شوێنێکیتر رانەوەستان.؟**

– خۆ ئێمە نەمان ئەزانی بۆ ئەو شوێنەمان دەبەن، بۆیە ئەگەر لەهەر شوێنێکی تر رابوەستایا وامان دەزانی ئەوە ئەو جێگەیەیە کە بۆ ئێمە

دانراوه، كاتێ له تۆپزاوا دەرچووین ئەو كورەی ووتم كه پێشمەرگه بوو دەستگیركرابوو (ئەنوەر تەیار) ئەو ووتی من پێشتر له ئیشغاڵ ئیشم كردووه شارەزام، ئیتر نازانم هەر به راستی شارەزابوو یان بۆ ئەوەی لای پەنجەرەكەوە بێت كه هەواكەی فێنكتر بوو وای دەووت، سەرەتا ووتی دەمان بەن بۆ موسڵ. هەرچەندە هیچ كەسێك له ئێمه بەتەمای ژیان نەمابوو، ئەمانزانی چارەنوسمان مردنه، بەڵام كاتێ ووتی دەمابەن بۆ موسڵ ئیتر لەناو سەیارەكە بووه گریان و شایەتمان هێنان ئەتووت لەناو مزگەوتداین، چونكه لەناو كورددا وا ناسرابوو كه موسڵ شوێنی ئیعدامكردنی كوردە. بۆیه هەموومان ترسی ئەوەمان لێنیشت كه ئیعدامامان دەكەن. لەیەك دەقەیا چەندین خەیاڵی جیاجیامان دەكرد، له لایەكەوه دەترساین و له سەرێكیشەوه ئەمووت ئەگەر بۆ ئیعدام كردنمان بەرن ئەوه رەنگه جارێكی تر كەسوكارمان ببینینەوه. چونكه ئەوه نەریت بوو هەركەسێكیان ئیعدام بكردایا رێگەیان دەدا كەسوكاری مەواجەی بكەن. ئەوەندە خەمی ماڵ و مناڵەكانم بوو كه هەواڵێكیان بزانم، ئەمووت ئەگەر ئەم حكومەته هەر دەمانكوژێت ئەوه خوایه بینێی له دڵی سەدام بمانبات له موسڵ ئیعدامامان بكات تا بۆ یەكجاری تر چاوم به ژن و مناڵ و دایكم و خوشكەكانم بكەوێتەوه. چونكه من نەمدەزانی ئەوانیش چیان بەسەر هاتووه و لەوه دەترسام ئەوانیش وەك ئێمه بەم

ڕێگەیەدا بەرن، بەو وەزعەی خۆمەوە دڵم هەر لەلای ئەوان بوو کە منالەکانم بەرگەی ئەم تینوێتی و گەرمایەی ناو ئەم سەیارەیە ناگرن و هەموویان دەمرن.

دوای ئەوەی سەیارەکان ماوەیەک ڕێگەی تریان بڕی کاک ئەنوەر ووتی ئەوەڵا ڕێگەی روومادیە، ئیتر نازانم بۆ ئەوەی بوو کەمێک دڵی خەڵکەکە بداتەوە یان هەر بەڕاستی ئاوا شارەزابوو، ئیتر هەر ڕێگەیان بڕیی و هەر تەواو نەبوو، بەخوا ڕەنگە بڵێم هەشت نۆ سەعات بە ڕێگەوەبووین لە شوێنێک سەیارەکان راوەستان و پاش کەمێک کەتنەوە رێ. سەرەتا ئێمە واتێگەیشتین ڕەنگە بەنزینیان تێکردبێت، بەڵام ئەوانەی لە پەنجەرەکەوە تەماشایان دەکرد ووتیان ئەوە لای مەرکەزێکی پۆلیس وەستاوین و هەموو سایەق و پاسەوانەکانیان گۆڕی.

*** ئێوەیان خستە ناو سەیارەی ترەوە، یان سایەقی سەیارەکەی ئێوە دابەزیی و کەسێکی تر هاتە شوێنی ئەو بۆ ئەوەی سەیارەکە لێخوڕێت.؟**

– نا، ئێمە هەر لە شوێنی خۆمان بووین سایەقەکەیان گۆڕی.

*** هەستتان نەکرد بۆ چی ئەو گۆڕانکاریە کرا.؟**

– ئەوکاتە نەخێر، بەڵام ئێستا دەڵێم دیارە بۆ ئەوە بووە ئەو سایەقەی پێشوو کە ئێمەی لە تۆپزاواوە بردبوو، تا ئەو شوێنە چارەنوسی ئێمە بزانێت و ئەم سایەقە تازەیەش لەوێوە ئاگای لە ئێمە بێت و نەزانێ لە کوێوە هێنراوین، دەڵێم لەوە دەچێت بۆ ئەوە بووبێت کەس بە چارەنوسمان نەزانێت.

*** تەنها سایەقەکەیان گۆڕی، یان ئەو سەربازەش وا لە نێوان ئێوە و سایەقەکە بوو.؟**

– ئەویشیان گۆڕی، ئەو دابەزیی و یەکێکی تر هاتە شوێنەکەی.

*** جل و بەرگەکەی لەبەری بوو، هەر لە جل و بەرگی هەمان سەربازی پێشوو بوو.؟**

– وەڵاهی نازانم ئەگەر هەمووی لەوچوبێت یان نا، لە بەرچاو ئێمە هەموویان هەر وەك یەك وابوون.

*** ئەوەندەی هەستتان پێکرد، تەنها سایەق و پاسەوانەکەی ئێوەیان گۆڕی، یان هی هەموو سەیارەکان.؟**

– ئێمە تەنها دەروازەیەك دەرەوەی لێوە ببینین ئەو پەنجەرە بچوکەی دەرگاکە بوو، کە ئەویش لە ئاوێنەی سایەقەکەوە لایەکی دواوە دیاربوو، بەوەیا هەندێ شتمان دەبینی. ئەوانەی لەوێوە تەماشای دەرەوەیان دەکرد وتیان ئەوە سایەقی سەیارەکان و حیمایەکانیان گۆڕی و وابزانم هەر لەوێوە شۆفرلێت عەسکەری و شۆفلێیان بەرچاو کەوتبوو، ئیتر بەجارێ هەموومان هێز لە گیانمان بڕا، وتمان رەمیمان دەکەن و دەمانخەنە چاڵەوە. توشی وەزعێك هاتبووین باس ناکرێت ئەوەندە ناخۆش بوو، ئێمە نزیکەی هەشت بۆ نۆ سەعات بوو لەناو ئەو سەیارە سەرداپۆشراوە بووین و هەموومان تەنگەنەفەس بووین ئەوەندە بە ئازار بوو خواخوامان بوو ئەگەر دەشمانکوژن لە شوێنێك راوەستێ و دەرمانبکەنە دەرەوە ئەگەر یەك دەقیقەش بێت جارێکی تر ئاو و هەوا و دونیا ببینین ئیتر با بمان کوژن. کەچی ئەوەنەی لای ئەو مەرکەزە راوەستا تا سایەق و حیمایەکانیان گۆڕی ناو ئەو سەیارەیە خۆی چەنێ گەرم و ناڕەحەت بوو، ئەوەنەی تر گەرم بوو ئەتووت لە ژێرەوە ئاگریان بۆ داخستووە. نازانم پێشتر هی ئەوە بوو کە رێگەی دەکرد و هەواکە بەخێرایی لێی ئەدا، یان هەر بەڕاستی لەو کاتەی راوەستا بە ئاگر ئاوا گەرمیانکرد، هەر خەریك بوو بتاسێین، بەخوا چوار پێنجێك لەوێ بوورانەوە ئەوەنە گەرم و ناڕەحەت بوو، ئەمجارە خواخوامان بوو

بکەوێتەڕێ و هەرچۆنێك بوو ئەوکاتانەی رێگەی دەکرد زۆر باشتر بوو لەوەی کە راوەستابوو. ئەگەر بۆ ئەوە راوەستابوون ئازادیشت بکەن، ئەوەنە نارەحەت بوو خۆزگەمان دەخواست بکەوێتەڕێ ئەگەر رۆیشتن بۆ مەرگیشە.

ئەو ماوەیەی راوەستا رەنگە هەر بایی ئەوە بووبێت سەیارەیەك نەفەر دابەزێت، بەڵام لای ئێمە ئەوەنە زۆر بوو بەقەدەر هەموو دوریی و ماندوێتی رێگەکە دەبوو، چونکە دڵمان خەریك بوو دەتەقی لەتاو گەرماو بۆ کەمێك هەوا کە هەڵیمژین. دوای ئەوەی سەیارەکان بەڕێکەوتن ئەو کاك ئەنوەرەی باسم کرد ووتی برادەران ئیتر نازانم بۆ کوێمان ئەبەن، رەنگە بمانبەن بۆ رەمیکردن. هەرچەندە زۆر دەمێك بوو باوەڕمان وابوو کە بۆ کوشتنمان دەبەن و هەریەکەمان لە دڵی خۆمانەوە ئەو مردنەمان هێنابووە بەرچاوی خۆمان، بەڵام ئێستا کاتێ یەکێك بە دەنگی بەرز پێمان دەڵێ بۆ کوشتنمان دەبەن، ئیتر هەست دەکەیت خەیاڵەکەت وا بوو بەڕاست و لێی نزیك دەبیتەوە. زیاتر ترس و نائارامی بە سیمای هەموومانەوە دەرکەوت، تەماشای هەر کەسێکت دەکرد دەتبینی لە چاویا خواحافیزیت لێدەکات. هەر یەکەمان کەسوکار و خۆشەویست و ئازیزانمان دەهاتنە بەرچاومان، بە خەیاڵ گەردن ئازایی و ماڵئاواییمان لێیان دەکرد. هەموومان رەنگمان چووبوەوە سەریەك، هەموومان وەك یەك دەممان کردبووەوە، وەك یەك تەماشای یەکترمان دەکرد.

*** ئەنومر ئەیار بەچیدا هەستی بەوەکرد کە ئیتر بۆ گوللەبارانکردنتان دەبەن.؟**

– نالێم ئەو پێشتر ووتی من لە ئیشغاڵ ئیشم کردووە و ئەم ناوە شارەزام، بۆیە زۆرتر ئەو لە پەنجەرە بچوکەکەوە تەماشای دەکرد و زوو زوو ئەوەی دەیبینی بۆ ئێمەی دەگواستەوە، لەوە ئەچوو هەر بەڕاستی شارەزا بووبێت، چونکە بەیانیەکەی کە لە تۆپزاوا بەڕێخراین ئەو ووتی بەرەو موسڵ دەمانبەن، دواتر ووتی ئەوە ڕێگەکەیان بەرەو روومادی گرتەبەر، دوای ئەوەی لای ئەو مەخفەرەش راوەستان و سایەق و پاسەوانەکانیان گۆڕی وتی شۆفلّم و شۆفرلێتی پڕ لە قوات خاسەم بینی، بەوەیا ئەیووت بۆ گوللەباران کردنمان دەبەن. چونکە خۆیی پێشمەرگە بوو لە ئێمە دونیا دیدەتر بوو. رەنگە ئاوا نزیکەی نیوو سەعاتێ تر لەو مەخفەرەوە هەر بەسەر جادەی قیردا ڕۆیشتبن، سەیارەکان خاویان کردەوە و ئیتر هەمووومان دڵمان توندتر بوو، زۆرێکی بە دەنگی بەرز دەگریا، بەزەییمان بەخۆماندا دەهاتەوە، هاوارمان بۆ خوا دەکرد بگاتە فریامان، ئێمە هەر هات و هاوارمان بوو کاتێ سەیارەکان هێواشیان کردەوە هەستمانکرد لە سەر جادە قیرەکە لایاندا و چووە سەر رێگایەکی خۆڵ، ئەوانەی لەو پەنجەرە بچوکەوە تەماشایان دەکرد ووتیان ئەوە

لایەکی ڕێگاکە ئاوە و لایەکەی تری هەمووی دارخورمایە. بڕوا بکە هەرچەندە سور دەمانزانی وا بۆ گوللەبارانکردنمان دەبەن، کاتێ وتیان ئەوە لایەکی ڕێگاکە ئاوە، هەستم دەکرد زۆربەمان جۆرێك لە خۆشحاڵی بە رووخسارمانەوە دەرکەوت، لەو بێ ئومێدی و هیلاکی و تینوێتیەدا ئاو ببینی، ئومێدی ئەوەمان لادروست بوو بەڵکوو خوایە ئەگەر هەر دەشمان کوژن بەڵام پێشتر بهێڵن بۆ دواجار ئاو بخۆینەوە و تینوێتیمان بشکێت. بەڵام ئەوەندەی پێنەچوو سەیارەکان بەلای راستدا وەك بڵێن لایاندایەوە و ئیتر ئاوەکە دیار نەما، جارێکیتر نائومێد بووینەوە و لەوە ئەچێت بۆیە ئەو ڕێگەیەیان هەڵبژاردبێت و لەوێوە بۆ شوێنی گوللەبارانکردنەکە ئێمەیان بردبێت تا بە بینینی ئەو ئاوە، ئەوەندەی تر عەزاب بچێژین، کە ئێمە هەموومان بۆ چۆرێك ئاو خەریکە شێت دەبین و سەیارەکانیش بە لێواری ئاوێکدا تێپەڕ دەبن، وەك بڵێی دەیانویست پێمان بڵێن ئەوەش ئاو و بەڵام نایەڵین لێی بخۆنەوە.

ڕێگەکە وورده ورده دیار نەدەما، ئیتر هەمووی دەشتێکی لماوی بوو، زیاتر سیماکانی مەرگ دەردەکەوتن و هەستمان دەکرد لە شوێنی گوولله‌بارانکردنەکان نزیك دەبینەوە، لە رووخساری هەمووماندا ترسی زیاتر و نائومێدی قوڵتر دەردەکەوت. ئەو کاك ئەنوەرە کەوتەوە قسەکردن ووتی هەمووتان شایەتمان بێنن و تۆبە بکەن و گەردنی یەکتر

ئازاکەن پارەتا لای هەرکەسێکە گەردنی ئازاکەن، کێ خراپەی لەگەڵ کردوون گەردنی ئازاکەن، ئێمە کەسمان یەکتریمان نەدەناسی تا قەرزاری یەکتری بین و دڵمان لەئاستی یەك گەردی گرتبێت، تەنها پێکەوە هاوسەفەری مەرگ بووین و ئەوەندەمان عەزاب چەشت لەناو ئەو سەیارەیە ئەگەر تاوانباریش بووبێتین لای خوا، ئەوە هەرچی گوناهمان هەبوو هەڵوەری بوو. هەمووومان کەوتینە شایەتمان هێنان و بەدەم گریانەوە دەستمان بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوە لە خوا دەپاڕاینەوە. لە ناکاو گوێمان لە دەنگی تەقەبوو، دیاربوو یان بەهۆی ئەوەی ئێمە لەو شوێنە نزیك دەبووینەوە کە تەقەکانی لێوە دەکرا بۆیە لە پڕ گوێمان لە تەقەکان بوو، یان هەروابوو تەقەکان لەناکاو بوون. نازانم کاك ئەنوەر بوو یان یەکێ لە سجنەکانی تر بوو ووتی کێ ئەڵێ ئەوە موعارەزە نین و پەلاماری سەیارەکانیان دابێت، نەتانبیستووە ئەوانیش وەك پێشمەرگەی خۆمان چەکداریان هەیە. ئەم قسەیە لەلایەك بۆ ئێمە خۆش بوو کە ئیشەڵا ئەوە خوا بە فریامان کەوتووە و ئەو چەکدارانەی ناردووە، لەلایەکیش دەترساین دەمانووت کێ دەڵێ ئەوان دەزانن ئێمە سجنین و هەموومان ناکوژن، ئیتر لە هەموو شتێکدا توشی ڕاڕایی هاتبووین چەنێ ئومێدمان هەبوو ڕزگار بین ئەوەندەش کوشتنەکەمان لە بەرچاو بوو. سەیارەکەی ئێمە ڕاوەستاو دەنگی تەقە کردنەکانیش هەر دەهات، سەرەتا واهەستمان کرد هەموو سەیارەکان ڕاوەستاون، وەك چۆن پێشتر لە ڕومادی لای مەخفەرەکە ڕاوەستان، بەڵام دیاربوو تەنها سەیارەکەی

ئێمە بوو، چونکە وەك بڵێی بەنتەڕناشی دەکرد، یان زەویەکە قوڕولیتە بوو یاخود ئەوەندە لم بوو تایەکەی دابەزیبووە ناویەوە، ماوەیەك هەر نەڕەی سەیارەکە هات و هەر نەدەجولا، دیاربوو بە شۆفلّ دەریانکرد چونکە یەك دووجار سەیارەکە دواوەی لە زەوی بەرز بوەوەو دای بە زەویدا، ئەو شۆفلانەی هێنابویان بۆ ئەوەی خۆڵیان پێبکەن بەسەرماندا، بەچێلەکەی سەیارەکەی ئێمەیان پێدەرکرد و خستمانیەوەڕێ بەرەو ئەو شوێنەی بۆ کوشتنمان دیاریکرابوو. کەمێکی تر بەڕێگەوە بووین ئیتر سەیارەکە راوەستاو دیار بوو هەموو سەیارەکانی تریش هەر راوەستابوون، لە ناکاو دەنگی تەقە دەهات و لەپڕ نەدەما، جاری وابوو بە سەلە تەقە دەکراو جاری وابوو بە تاك تاك، ئێمە جارێ نەماندەزانی ئەوە چیە روودەدات، بەلام باوەڕمان وابوو ئەوە ئێمەین ئەو کوردانەی لە تۆپزاواوە خراینە ناو ئەم سەیارە سەرداپۆشراوانەوە دەکوژرێین. ئیتر تەواو نائومێد بووین لەوەی تازە خواش بە فریامان ناکەوێت.

*** نازانی ئەو کاتەی گەیشتنە ئەو شوێنەی سەیارەکان راوەستان، کەی بوو.؟**

– تازە خۆر ئاوا بووبوو، چونکە هەروا چەند دەقەیەك بوو گەیشتبووین هێشتا سەیارەکە هەر ئیشی دەکرد، لایتی شۆفلّمان بینی وا خۆڵ دەکاتە سەر چاڵدا، دیار بوو ئەو خەڵکانەی دەکوژران بە شۆفلەکان دایان

دەپۆشی. ئەو سەیارەیەی ئێمەشی تیابووین لایتەکەی داگیرساند ئیتر روونتر بەهۆی روناکی لایتەکەوە دەرەوەمان دەبینی ئەویش بەتۆرە لە پەنجەرە بچوکەکەوە تەماشامان دەکرد. دیاربوو دوو دوو هاورێکانی ئێمەیان دەبردە پێشەوە تەقەیان لێیان دەکرد و هەڵیانیان دەدایە چاڵەکەوە، نازانم لە بەردەمی هەموو سەیارەکان حاڵەتی کوشتنەکان بەم جۆرە بوون یان تەنها سەیارەکەی ئێمەیان بردبووە ئەو شوێنە تا لێمانەوە دیاربێت و بزانین پاش کەمێکی تر بەو جۆرە ئێمەش دەکوژن. بەڵام لەوە دەچوو هەمو سەیارەکان ئاوا برابێتنە دیار چاڵەکان و هاورێکانی ئێمە هەموویان ئاوا چاویان لە کوشتنی وەجبەیەکی تری گەنجی کورد بووبێت، رەنگە هەر بۆ ئەوەش وایان کردبێت کە ئازاری زیاتر بچێژین بەرلەوەی خۆمان بمرین.

*** ووتت دوو دوو گەنجە کوردەکانیان دەبردە دیار چاڵەکان و گوللەباران دەکران. ئایا هەر لە سەیارەکان بەو جۆرە دوو دوو دا دەگیرانە خوارەوە و راستەوخۆ بۆ دیار چاڵەکانی مردن دەبران.؟**

– لە راستیا ئێمە ئەوەمان لێوە دیار نەبوو ئەوان چۆن لە سەیارەکان داگیرابوون، بەڵام لەوە دەچوو وەجبەی هەر سەیارەیەك هەموویان داگیرابێتنە خوارەوە و کۆمەڵکرابێتن و ئینجا دوو دوو ریز کرابێتن بۆ

کوشتن. وا دەردەکەوت چونکە بەدوای یەکتریەوە دوای ئەوەی دوان رەمی دەکران و دەخرانە ناو چاڵەکەوە بەدوای ئەودا دوانی تریان دەبردە پێشەوە، ئیتر حاڵەتەکان هەمووی وەك یەك نەبوو، هەبو چاوی بە پەڕۆی سپی بەسترابوو، هەبوو نەبەسترابوو. هەبوو دەستڕێژی گوللەیان لێدەکراو هەبوون فیشەکیان دەنا بە ئەژنۆیانەوە و دەکەوتنە ناو چاڵەکەوە، هەبوو بە دەمانچە فیشەکیان پێیانەوە دەنا، کوشتنی هیچیان لەوی تر نەدەچوو، نازانم ئایا کۆمەڵێ جەلادیان هێنابوو دەبێ هەموویان بەشداربن لە کوشتنەکان، نازانم بە ئارەزوو وایان دەکرد، چونکە هەندێکی دیاربوو تەنها بریندار دەبوون و دەخرانە چاڵەکانەوە، هەر لەوە دەچوو ویستبێتیان بە زۆرترین ئازارەوە بمرین.

*** وتت هەبوو بە سەلەی کلاشینکۆف و هەبوو بە دەمانچە دەیانکوشت، ئێوە بەو جۆرە چاوتان لە گوللەبارانکردنەکان بوو تا ئەو حاڵەتانە ببینن.؟**

— بەڵێ، هەر لەبەردەم لایتی سەیارەکەی ئێمە بوو.

*** کەواتا جەلادەکانتان لێوە دیار بوو.؟**

– بەڵێ، جلی مغاویری سەوز لەبەریان بوو، بە پەڕۆی رەش دەموچاویان داپۆشرابوو.

*** کاتێ دیمەنی ئەم کوشتنانە بە بەرچاوی ئێوەوە رووی دەدا، هەستتان چۆن بوو.؟**

– مرۆڤ کاتێ بە بەرچاویەوە ئاوا بەشێوەیەکی دڕندانە کۆمەڵێك خەڵکی بێ تاوان بکوژرێن دەبێت هەستی چۆن بێت، بە تایبەتیش کە ئێمە دەمانزانی خۆشمان وا لە ریزی ئەواندایـن و پاش کەمێکی تر نۆرەی ئێمەیە بەو جۆرە بمانکوژن. بۆیە تەگبیرمانکرد کاتێ داماندەگرنە خوارەوە بۆ کوشتن دەبێ بەرگری بکەین.

*** ئێوە چەند کاتژمێر بوو لەناو ئەو سەیارەیە بوون.؟**

– دوانزە سانزە سەعات زیاتر بوو.

*** وەك پێشتر باسی تینوێتی و گەرمای ناو سەیارەکەت کرد، کە دوانزە سیانزە سەعات بەو جۆرە مابوونەوەو برستی لێبڕیبوون توانای ئەوەتان هەبوو لە حاڵێکی وادا بەرگری بکەن.؟**

– وەڵا لەڕاستیا ئەوەندە هیلاك و شەكەت بووین نەماندەتوانی بە ئاسانی لەشوێنی خۆمان هەستینەوە، لەو ماوە زۆرەی ناو سەیارەكەدا چەند جارێك خەڵك هەبوو دەبورایەوە، بەڵام ئێمە وا بەچاوی خۆمان دەمانبینی چۆن هاوڕێكانمان بەو جۆرە دەكوژن و دەشمانزانی دوای ماوەیەكی كورت ئێمەش بەو جۆرە دەبەن، ئیتر ئەوە دووا وزەو توانامان بوو كە دەبێ هەموو هێزێك بدەینە خۆمان و شتێ بكەین. ئەویش لە راستیا كاك ئەنوەر تەیار كە خۆی پیاوێكی جەربەزە بوو وورەی ئەدا پێمان و هانمانی ئەدا كە دەبێ شتێك بكەین. كاتێ تەواو دڵنیابووین كە ئەوە شوێنی گوللەبارانكردنمانە و كە بە بەرچاوی خۆمانەوە خەڵكەكەمان دەبینی چۆن دەكوژرێن، هەرچەندە لە ترسا چۆكمان شكابوو هەموو قوڕگمان وشك و گیانمان دەلەرزی، بەڵام كاك ئەنوەر هەندێ قسەی كرد ورەی كردەوە بە لەشمانا، ووتی براینە ئێمە ژمارەیەكی زۆرین كاتێ دامان دەگرنە خوارەوە با بەهەمووومان پەلاماریان بدەین و هەرئەوەندە چەكێ كەوتە دەستمان دڵنیابن دەتوانین یەك دوانێكیان لێبكوژین، خۆ ئەوان ئێمە هەر دەكوژن دەكوژن، ئەگەر بتوانین كارێك بكەین تەنها یەك كەس لە ئێمە رزگاری بێت و بگاتەوە كوردستان هەواڵی ئەوە بەرێتەوە بەم جۆرە كوژراوین ئەوە هەر باشە، خۆ ئەگەر كەسیشمان رزگارمان نەبێت بۆ وەك جوجگ هەموومان بێ

دەسەڵاتانە بکوژن، کورد قەت بێ غیرەت نەبووە با ئێمەش یەك دوانێ لەوان بکوژین.

کاك ئەنوەر بەم قسانە هەستمانی جوڵان و بەشێکمان بەتایبەت ئەوانەی دەماننناسی و لێوەی نزیك بووین وتمان وەڵا ئامادەین چی ئەڵێی وا دەکەین.

کوڕێك وابزانم ئەویش هەر پێشمەرگە و برادەری خۆی بوو ئەو وتی ئەگەر دەرگاکەیان کردەوە و هاتن دامانبگرنە خوارەوە من پەلاماری چەکەکەی دەستی دەدەم و ئێوەش پەلاماری خۆی بدەن تا چەکەکەی لێدەسێنین. ئەم قسانە و خۆئامادەکردنمان بۆ بەرگری هەست و هۆشی هێنایینەوە و هەریەکە لە شوێنی خۆیەوە ئومێدی ئەوەی لادروست بوو رەنگە ئەو کەسە من بم کە رزگارم دەبێت، ئیتر سەرلەنوێ بەتەمای ژیان بووینەوە کە پێش چەند ساتێکی کەم هیچ کەس ئەو ئومێدەی نەبوو. وەك ئەوە وابوو هەموومان دڵنیابین یەکێکمان ئازاد دەکەن و دەگەڕێینەوە بۆ کوردستان، بەڵام کەسمان نازانین ئەو کەسە کامامانین و هەموومان حەزی ئەوەمان بۆ دروست بوو ئەو کەسەبین.

*** لە دوای ئەوەی تەگبیرتانکرد بەرگری بکەن، تا ئەوکاتەی دەرگاکەیان لەسەرتان کردەوە چەنێکی خایاند.؟**

– یەکەم جار هەر گەیشتینە ئەو شوێنە یەکەم دەرگایان لێمان کردەوە، ئەها ووتم سەیارەکە دوو دەرگای هەبوو دەرگایەکی ئەوەی نێوان ئێمەو شوێنە بچوکەکەی پشت سایەقەکە و دەرگایەکیشی ئەوەی بۆ دەروە دەچوویت. دەرگاکەی یەکەمیان کردەوە و سەربازەکە دابەزی و ئیتر تەنها دەرگاکەی سەر ئێمە مابوو، ئێمە چاوەڕێ بووین ئەو دەرگایە بکرێتەوە. هەرچەندە ئێمە پێشتر بەتایبەتی کە لای مەرکەزەکە سەیارەکە رەنگە هەر دەدەقەیە وەستابێت هەموومان خەریك بوو دەمردین ئەوەنە گەرم بوو، خوا خوامان بوو ئەگەر بۆ مردنیشە زوو بەرێبکەونەوە و دەرگاکەمان لێبکەنەوە تا زوو بمرین. بەڵام کە گەیاندمانیانە شوێنی گوللەبارانکردنەکەو بە بەرچاومانەوە دوو دوو گوللەباران دەکران، ترس و نائومێدیەکە وایلێکردین کە ئەگەر نەك دەدەقە دە رۆژی تریش لەناو سەیارەکە بمانهێڵنەوە پێمان خۆشتر بوو، چونکە کردنەوەی دەرگاکە کۆتایی ژیانی ئێمە بوو. خواخوامان بوو زوو نۆرەمان نەیات، هەرچەندە بینینی ئەو دیمەنەش ئازاری هەر یەکیان بۆ ئێمە مردنێك بوو، بەڵام رووح لەشوێنی سەختدایە هەر نەمان دەویست زووتر بمرین خواخوامان بوو نەیەن بەلای سەیارەکەی ئێمەدا تا ئەگەر هەر بە ئازاریشەوەیە درەنگتر بمرین، چونکە مرۆڤ چەند لە ناڕەحەتیا بێت هەر ژیانی بەلاوە باشترە لە مردن. بەڵام دوای ئەوەی تەگبیرمان

کرد بەرگری بکەین و ئومێدی ئەوەمان هەبوو کە ڕەنگە لێمان ڕزگاری بێت، ئیتر کێ کەوتبووە کەوڵمان و خواخوامان بوو زووتر بێن و دەرگاکە بکەنەوە تا پەلاماریان بدەین، چونکە وامان دەزانی بەو جۆرە دەتوانین لە دەستیان هەڵبێین و دەمانووت ڕەنگە بەهۆی ئێمەوە ئەوانەی ناو سەیارەکانی تریش وابکەن و خەڵکێ زۆر بتواین ڕزگار بین.

***    بە دیاریکراوی پێت نەووتم چەنێک بەو جۆرە مانەوە و چەندی خایاند تا دەرگاکەیان کردەوە.؟**

–    ئا، وەڵا ناڵێم ئیتر یان هی ئەوەبوو کە ئێمە حەزمان دەکرد دەرگاکە بکەنەوە و لەبەرچاو ئێمە وەختەکە ناڕۆیی یان لە ڕاستیا زۆری پێچوو، لە نێوان نیووسەعات بۆ سەعاتێك ماینەوە و چاوەڕێی کردنەوەی دەرگاکەمان دەکرد.

***    کە دەرگاکەیان کردەوە، بەرنامەکەی خۆتان جێبەجێکرد.؟**

–    خۆی یەکەم جار کاك ئەنوەر ووتی کاتێ دامان دەگرنە خوارەوە بەهەمووومان پەلاماری چەند کەسێکیان بدەین، بەڵام ئەو کوڕەی تر ئەگەر هەڵە نەبم وابزانم پێیان دەووت (کاك سەلام)، ئەو ووتی هەر دەرگاکەیان کردەوە من پەلاماری دەدەم، ئیتر ئێمە تەنها بەتەمای ژیان

بووین و نەمان دەزانی کامەیان دەکەین، ئایا هەر دەرگاکەیان کردەوە پەلاماریان دەدەین، یان کاتێ هەموومانیان داگرتە خوارەوە ئەوجا دەست بە پەلامارەکە بکەین.

*** دوواجار کامیتانکرد.؟**

- دوو سەرباز هاتنە ناوەوە کە دەرگاکەیان کردەوە ئەو کوڕەی ووتم وابزانم ناوی کاك سەلام بوو هەڵیڕژایە یەکیاندا و پەلاماری تفەنگەکەیدا، ئیتر لەو لەحزە کورتەی ئەم پەلامارەیدا و ئێمە هەریەکە لای خۆیەوە کەوتە جوڵەی ئەوەی بەرەو لای بچین، سەربازەکەی تر تەقەی لە کاك سەلام کردو یەکسەر شەهید بوو. کەوتە نێوان دەرگاکەوە، دەرگاکەی ئێمە بەکراوەیی مایەوە، دوو سەربازەکە خۆیان هەڵدایە خوارەوە و دەرگاکەی دەچووە دەرەوە ئەوەیان لەسەرمان داخستەوەو وورەووریان لێپەیابوو، ئێمەش هەموومان حەپەساین یەکەم هەوڵ و بەو جۆرە ئەو کوڕەیان شەهیدکرد، هەموومان تاساین، بەڵام ئەوەی پێشتر هیچ تاقەتی نەبوو ئەوەندەی تر حەماس گرتمانی و تازە هیچ چارەسەرێك نەماوە لەوە زیاتر کە هەوڵدەین چەکمان دەستکەوێت. نازانم بڵێم چەند دەقەی پێچوو تا ئەوان گەڕانەوە، لەو ماوەیەدا جارێکیتر کاك ئەنوەر هەندێ قسەی بۆ کردین و غیرەتی داینێ کۆڵ نەدەین، ئیتر زۆربەمان تەکمان

دابووه ئەو بۆشاییە بچوکەی نێوان هەردوو دەرگاکە، ئەوان لە دەرەوە غەڵبەغەڵبیان بوو دەنگی تەقەش هەر بەردەوام بوو لە شوێنەکانی نزیکمان، ئێمەش جارێکیتر تەگبیرمان کردەوە ئەمجارە کە دەرگاکەیانکردەوە یەکێ خۆی بخاتە ناو دەرگاکەوە بۆ ئەوەی دانەخرێتەوە تا هەموومان رادەکەینە خوارەوە. کە دەرگاکەیان کردەوە یەکسەر کوڕێکی چوارشانە بەخوا نازانم ناوی چی بوو من نەمدەناسی بەڵام دیاربوو برادەری ئەو جەماعەتەی کاك ئەنوەر و ئەوان بوو خۆی هەڵدایە ناو دەرگاکەوە و یەك دوانێ پەلاماری چەکی دەستی یەکێ لەوانەیاندا کە بۆ ناو سەیارەکە دەهات. دیاربوو دوای ئەوەی ئەوان یەکێکیان لە ئێمە کوشت لەناو سەیارەکە باوەڕیان وانەبووە کە جارێکیتر ئێمە بوێرین بەرگری بکەین، چونکە زۆر بە ئاسایی دەرگاکەیان کردەوەو بۆ ناو سەیارەکە ملیان نا، ئێمەش بەهۆی ئەوەی بەو جۆرە ئەو کوڕەیان شەهید کرد و تۆزێك ترسمان شکا، زۆر بە هەڵمەتەوە بۆیان چووین. ئەوان سێ کەس هاتبوونە ناو سەیارەکەوە ئێمەش کۆمەڵێك پەلاماریانماندا بووە راپسك راپسك، کاك ئەنوەر و یەکێ تر پەلاماری تفەنگەکەیاندابوو لایەکی چەکەکە کەوتبووە دەستی ئێمە و سەرێکی بەدەستی سەربازەکەوە بوو، بەخوا وابزانم نەجمەوشتی واش بەسەر شانیەوە بوو. یەکێ لە هاوڕێکانمان مشتەکۆڵەیەکی دایە ناو چاوی

کابرای نەجمە لەسەرشاندا هاوارێکی لێهەستاو هەر ئەوەنەی بۆ کرا مەغزەنی تەفەنگەکەی دەرهێناو خۆی فڕێدایە خوارەوە، ئێستا تفەنگێك کەوتە دەستی ئێمە و ئەگەر یەکێ بوو یان دوان لە سەربازەکانیش کەوتنە ناو ئێمەوە، بەڵام ئەوەی خۆی هەڵدایە خوارەوە هاواریکرد تەقەیان لێبکەن، هەر بە لەحزە لە چەند لایەکەوە بووە هاڕەی گوللە ئیتر کەس ئاگای لەکەس نەماو هەموو کەوتینە سەر یەکدا. بۆ ماوەی زیاتر لە پێنج دەقە ئەوان هەر دەستڕێژیان لە سەیارەکە دەکرد و لە هەموو لایەکەوە وەك سەرەن کوون کون بوو. دیاربوو بەهۆی ئەوەی ئێمە زۆربووین لەناو سەیارەکەو پێشتریش هەموومان تەکمان دابووە نزیکی دەرگاکە زۆربەمان لە شوێنێ کۆبووبینەوە، کاتێ تەقەکانیشیان کرد کەوتینە سەریەکدا سەرەتا هەستمکرد شتێك دایە ناو چاوی راستما، وا هەستمکرد فیشەکە، بەڵام پاش کەمێك زانیم فیشەك نەبوو، لەوە دەچوو گڕی تفەنگەکە بووبێت چونکە یەکسەر چاوم قەپات بوو. فیشەکێکیش بەر سمتم کەوت لەپشتەوە زانیم لێدرام، کاتێ کەوتم زانیم چەند لاشەیەك کەوت بەسەرمدا ئیتر بەو هۆیەوە چەنێ تەقەی تریانکرد هیچی بەر من نەکەوت، ئەو لاشانە بوونە هۆی ئەوەی فیشەکی ترم بەرنەکەوێت.

لەوە ئەچوو ئەوانەی تەقەکانیان دەکرد بەهیچ جۆرێك هەستیان نەکردبێت کەسێك بە زیندوێتی ماوەتەوە لە سەیارەکە، چونکە ئەگەر بیانزانیایا بە دڵنیاییەوە هەر دەمانیان کوشت، بەڵام دوای ئەوەی تەقەیەکی زۆریان کردو ئیتر هیچ دەنگێك هاوارێك نوزەیەك لەناو سەیارەکە نەما، ئەوان ڕۆیشتن و لە سەیارەکە دوور کەوتنەوە. خۆم ئێستا دەڵێم دوای ئەوەی ئەم حاڵەتەی ئێمە روویدا ڕەنگە لەوە ترسابن سەیارەکانی تریش بەرگری بکەن، بۆیە بەزوویی ڕۆیشتن و لە دوورتر دەنگی تەقە دەستیپێکرد، دیاربوو چوون و لە سەیارەکانی تر دەستیان بە پرۆسەی گوللەبارانکردنەکانیان کردەوە. ماوەیەکی زۆر بەو جۆرە مامەوە، هەست دەکەم بریندارم چاوم هیچ نابینێ و دەزانم سمتیشم سڕبووە ئیتر یان بەهۆی ئەوەی جەنازە کەوتووە بەسەرماو ئەو هەموو خوێنە بەلەشمەوەیە ڕەنگە گیانم سڕ بووبێت یان فیشەکەکە کاریگەر بووە. بەڵام دەزانم هۆشم بەخۆمە و دەزانم چی روویداوە، بیریش دەکەمەوە چۆن هەوڵبدەم دەرچم و بکەومەڕێ لەو شوێنە دوور بکەومەوە ڕەنگە ئەو کەسە من بم کە هەموومان هیوامان دەخواست کەسێك ڕزگاری بێت و هەواڵ بەرێتەوە بۆ کوردستان ئەو هەموو گەنجەیان بەو جۆرە کوشت. دەمووت دیارە خوا بۆ ئەوە منی ڕزگار کردووە و کەواتا دەبێ هەوڵدەم زوو لێرە ڕزگارم بێت. لەم بیرکردنەوانەدا بووم هەستم بە جوڵەکرد، لەترسا هەناسەم لەخۆم بڕی وامزانی سەربازەکانن و جارێکیتر گەڕانەوە بۆ لای سەیارەکە، پاش کەمێك

جوڵەکە زیاتر بوو ئیتر زانیم لەناو سەیارەکەی خۆمانە، تێگەیشتم کەواتا جگە لەمن ئەوە کەسێکی تریش زیندووە، ویستم بە قسە بانگێك بکەم بزانم ئایا کەسێکی زیندووە، بەڵام دەترسام ووتم رەنگە لە دەرەوە گوێیان لە دەنگم بێت و بگەڕێنەوە بمکوژن، لەوەش دەترسام کە یەکێ دوان لە سەربازەکان کەوتنە ناو ئێمەوە بەرلەوەی تەقەمان لێبکەن، کێ دەڵێت ئەو سەربازە نیە و بە زیندوێتی مابێتەوە و ئەگەر قسەبکەم ئاشکرام دەکات و دەمکوژن بۆیە ئەوەندەی تر خۆم بێدەنگ کرد. پاش ماوەیەکی کورت کە دوو سێ دەقە دەبوو کاتێك هەستمکرد یەکێك لە دەرگاکە چووە دەرەوە و گوێم هەڵخست هیچ دەنگێك نەبوو تێگەیشتم کە کەس لە دەوری سەیارەکە نەماوە و زانیم ئەوە کەسێکیتر رزگاری بووە، بۆیە بڕیارمدا منیش دەرچم بە هێمنی لە سەیارەکە هاتمە دەرەوە هەستمکرد دەشەلم دڵنیابووم برینەکەم زۆرە، بە شەلەشەل کەوتمەڕێ و بێ ئەوەی بزانم بۆ کوێ دەچم ئاوڕم نەدایەوە تا نزیکەی دوو کیلۆمەتر لە تەقەکان دورکەوتمەوە.

*** دوای ئەوەی خۆت لەسەیارەکە دەرچوویت هەستت نەکرد کەسی تری تیامابێت ئەویش وەك تۆ زیندوبێت.؟**

– من یەکمجار وام دەزانی تەنها خۆم زیندووم، بەڵام دوای ئەوەی کەسێکیتر پێش من لە سەیارەکە دابەزیی و منیش کەوتمە لابردنی لاشەکانی سەرم و وورده وورده بە زگەخشکێ بەرەو دەرگاکە چووم

هەستم بە جوڵەی تر کرد کە خەڵکی تریش لەناو سەیارەکە بە زیندوێتی ماونەتەوە.

*** ئەی وەک تۆ بانگت نەکرد لەترسی ئەوەی نەک سەربازەکان گوێیان لەدەنگت بێت، ئەو کەسەی تریش کە دڵنی هەستم کرد بە زیندوێتی لەناو سەیارەکە بووبێت، ئەویش هیچ قسەیەکی نەکرد.؟**

– نەخێر، لەوە دەچوو ئەویش وەک من هەمان ئەو هەستەی هەبووبێت کە بێدەنگی لەو حاڵەتەدا باشترین رێگا بووبێت بۆ رزگاربوون.

*** کاتێ لە سەیارەکە دابەزیت، ئەو دیمەنەی بەرچاوت کەوت چی بوو.؟**

– تاریکی و روناکی.

*** مەبەستت چیە لە تاریکی و روناکی.؟**

– سەرەتا کە دابەزیم دەوری سەیارەکەی ئێمە هەمووی ترس و تاریکی بوو، بەڵام لە دوورتر روناکی لایتی سەیارەو شۆفڵ دیاربوو، لەو شوێنەی

وا دەنگی تەقەكانی لێوە دەهات، دیاربوو لەوێ خەڵكی تریان گوللەباران دەكرد.

*** چەنێك دوور بوون لە سەیارەكەی ئێوەوە.؟**

– وەڵا رەنگە چەند سەد مەترێك بووبێت.

*** باشە ئەوكاتەی ئێوە لەناو سەیارەكە بوون و بەرلەوەی رووداوی تەقەكردنەكە روویدات، باسی ئەوەتكرد كە لە پەنجەرە بچوكەكەوە دەتابینی لایتی سەیارەكانی تر و شۆفلەكان لە نزیكتان كاریان دەكرد، وەك باستكرد گوللەبارانكردنی سەیارەكەی ئێوەش رەنگە هەر چەند دەقیقەیەكی پێچوبێت، چۆن لەو ماوە كورتەدا سەربازەكان و شۆفلەكان ئەوەندە لە ئێوە دووركەوتبونەوە.؟**

– ئا، ئەزانی ئەوە چۆن بوو كاتێ بەرەو شوێنی گوللەباران كردنەكە بردمانیان ئەها وتم لە رێگە سەیارەكەی ئێمە چەقی و ماوەیەكی پێچوو تا دەریانكرد، بەو هۆیەوە سەیارەكانی تر پێش ئێمە گەیشتبوونە شوێنی كوشتنەكان، كاتێ ئێمە گەیشتین وەك بڵێی رەنگە كەوتبێتینە لای پەڕی سەیارەكانی ترەوە كە هاورێكانمانی تیابوو. بۆیە چۆنێتی كوشتنی

ئەوانیشمان بینی چونکە ئێمە کەوتینە دوای ئەوانەوە بۆ کوشتن، پێش ئەوەی نۆرەی سەیارەکەی ئێمە بێت دیاربوو هەرجارەی سەیارەیەك لەوان بەتاڵ دەکراو بەو جۆرە دەکوژران کە پێشتر باسمکرد، ئەو رووداوەی سەیارەکەی ئێمە بەهۆی ئەوەوە بوو کە بەرگریمانکرد بۆیە هەر لەناو سەیارەکە دەستڕێژی گوللەمان لێکراو دانەگیراینەخوارەوە، ئەو کاتەی لەسەیارەکە دابەزیم ئەوجا کە بینیم ئەو ریزە سەیارەیەی پێشتر لە ریزی سەیارەکەی ئێمە بە دیار چاڵەکانەوە راوەستابوون و ئەوکات لەوێ نەمابوون تێگەیشتم کە ئەوکاتەی نەفەرەکانیان داگرتوون و لەبەر لایتی سەیارەکە کوشتویانن ئیتر دیارە سەیارەکان گەڕاونەتەوە بۆ هێنانی نەفەری تر چونکە ئەو کاتەی من دابەزیم، هیچ کام لە سەیارە نزیکەکانی ئێمە نەمابوو، تەنها لە دوورتر ریزی سەیارە دیاربوون. وە ئەوکاتەش کە من بەشەلەشەل رامکرد و لە شوێنی گوللەبارانکردنەکە دوورکەوتمەوە دەمبینی کە لایتی سەیارەکان دەهاتن و دەچوون وەك بڵێی بە پڕی نەفەرەوە دەچوونە شوێنی کوشتنی گەنجەکان و بە بەتاڵی دەگەڕانەوە، تا دوور دەکەوتمەوە زیاتر ئەو دیمەنەم دەبینی کە ئەو دەشتە هەمووی لایتی سەیارەبوو، چونکە تەختای بوو یەکەمجار هەر شوێنە نزیکەکانت دەبینی، بەڵام کە دوور دەکەوتیتەوە زۆرتر ناوچەکەت لێوە دەردەکەوت. ئەگەر شوێنێ بەرز هەبوایا لێوەی تەماشات بکردایا

ئەوە هەموو دیمەنەکانت بەجوانی دەبینی کە لە چەند شوێن کۆمەڵ کۆمەڵ لایتی سەیارە و شۆفڵ دیاربوون و ئیشیان دەکرد، کە ئیشەکەشیان کوشتن و داپۆشینی لاشەی ئەو هەموو گەنجەی کورد بوو.

*** کاتێک لە سەیارەکە دابەزیت و بە ئومێدی رزگاربوون کەوتیتەرێ، هەست ئەکەی ئاراستەیەکی دیاریکراوت گرتبێتەبەر بەرەو ئەوێ بچیت.؟**

– وەڵا خۆشم نازانم بۆ کوێ دەچووم، تەنها دەمویست لە سەیارەکە دوور کەومەوە، گیان بەوە بوو ئەو شوێنانەی کە عەسکەریی لێبوو بەهۆی لایتی سەیارەکان و نەڕەی شۆفڵەکانەوە دەتزانی لەکام ئاراستەن، هەوڵم دەدا بەرەو لای ئەوان نەچم، ئیتر بەهەرلایەکدا رۆیشتبم خۆشم نازانم ئێستا بڵێم لای راستم گرتەبەر لای چەپم گرتەبەر، هەمووی دەشت بوو وەك ناو لەپی دەست خوار و ژووری دیار نەبوو، تەنها ئەمزانی ئەو ئاراستەیەی گرتومەتەبەر لە لایتی سەیارەکان دوورم دەخاتەوە، ئیتر بێ ئەوەی بزانم بۆ کوێوە دەچم. توخوا با ئەوەشم بیر نەچێت سەرەتا ئەو کاتەی لە سەیارەکە دابەزیم تەماشایەکی ئەملاو ئەولامکرد و لە نێوان ئەو شوێنانەی رووناکی لایتی سەیارەی لێبوو بڕیارمدا تاریکی بگرمە بەر، پاش ئەوەی رەنگە هەر دوو بۆ سێ سەت

مەتر دورکەوتبێتمەوە لەترسا پێڵاوەکانم فرێدا، چونکە پێڵاوی لاستیق لەپێم ئەو خوێنەی بە لەشما دەهاتە خوارەوە گەیشتبووە ناو پێڵاوەکانم، خۆم بە هەنگڵەشەلێ دەڕۆیشتم کاتێ خوێنەکەشی تێچوو ئیتر ناو پێلاوەکە لوس بوو لەگەڵ هەنگاوەکانمدا هەم دەنگی لێوە دەهات و هەم لە پێم دەردەچوون، بۆیە فرێمدا و بەپێی پەتی درێژەم بە رێکردن دایەوە، هەرچەندە زەویەکە هەمووی لم بوو بەڵام شتێك هەیە وەك درك وایە لەو دەشتە سەوز بووبوو هەر جارنەجارێ یەکێ دەچووە پێمدا و دونیایەك ئازاری ئەدام.

هەرچەندە ئەوەندەی رێگەم بڕی هەر دەنگی دەستڕێژی گوللە هاڕەی دەهات لەو دەشتە چۆڵەیا و وا هەستم دەکرد هێشتا هەر لەناو تەقەکاندام، بەڵام کە ئاوڕم بۆ دواوە دایەوە بینیم بەشی ئەوە رێگەم بڕیووە و ئەوەنە دوورکەوتومەتەوە لە شوێنی گوللەباران کردنەکە ئیتر پشوویەك بدەم. دانیشتم بەڵام تینوێتی و وشکبوونی دەم و لێووم بڕستی لێبڕیبووم. نازانم پێشتر کە ڕێگەم دەکرد بەهۆی ڕۆیشتنەکەی خۆمەوە گوێم لە دەنگی هەناسەی خۆم نەبوو یان کە دانیشتم بۆ ئەوەی ئیسراحەتێك بکەم ئەوکات ئەو دەنگە لە سیەکانمەوە دەهات، یان هی ترسەکە بوو، هەناسەبڕکێم بوو دەنگی هەناسەکەم زۆر گەورە بوو ترسی ئەوەم لێنیشت ئێستا بەهۆی ئەم دەنگەوە ئاشکرا دەبم. خۆم ئەنوسان بە زەویەکەوە، هەر دوو دەستم دەخستە سەردەم و لووتم تا دەنگی

هەناسەکەم زۆر نەڕوات. بەو حاڵەوە ماوەیەك مامەوە تا کەمێك هێمن بوومەوە. ئیتر هۆشم یارمەتی ئەوەی دام پەنا بۆ خوا بەرم سەرەتا سێ چوار جار شایەتمانم هێنا و کەوتمە پاڕانەوە، زۆر زۆر پاڕامەوە، کوردستان دەهاتە بەرچاوم، دێیەکەی خۆمان ژن و منداڵ و دایك و خوشك و براکانم، هەموویان لەو بیابانە دەهاتنە بەرچاوم، یەکەمجار ترسی ئەوەم هەبوو کە دیارە ئەوانیش هەموویان هێنراون بۆ ئەم بیابانە و بەو جۆرەی ئەو خەڵکە کوژراون کە من بینیم، خوا دڵمی ئەدایەوە کە ئیشەڵا هەمویان ماون لەژیاندا و ئەمووت دیارە پشت بەخوا رزگارم دەبێت و دەگەڕێمەوە بۆ لایان بۆیە هاتنە بەرچاوم، بەڵام دەشمزانی براکەم کە تا قاعەکانی تۆپزاوا پێکەوە بووین و لەکاتی گواستنەوەمان بۆ ئەم بیابانە لێك جیاکراینەوە، دڵنیابووم ئێستا ئەو لێرەیە لەناو ئەو وەجبە سەیارانەی ترو گوولەباران کراوە، ئومێدێکم ئەدایە خۆم بەڵکوو ئەمە خوایە ئەویش وەك من رزگاری بووبێت و ئێستا لەم ناوە پەیابێت پێکەوە بگەڕێینەوە بۆ کوردستان. رەنگە نیووسەعاتێ ئاوا شتێ کەمتر لەوێ مامەوە، بەدرێژایی ئەو ماوەیە هەر جارنەجارێ دەستڕێژی گوللەیە، دەمزانی ئەوە هەموویان وەك من وان و ئەو کوردانەن کە لە گوندەکانی خۆیان دەستگیرکراون و هێنراون بۆ ئێرە و بەو جۆرە دەکوژرێن، لە تاوا ئەگریام، خۆم ژێر دەکردەوە، دەستم دەکردەوە بە گریان و کەس نەبوو دڵم بداتەوە، بەڵام دەمزانی ئەوە خوایە هیدایەتم دەدات کە خۆم وورەم ئەدایەوە خۆم و ئومێدی ئەوەم لای خۆم دروست دەکرد کە خوا منی لەو

هەموو گوللەیە پاراست گەیشتۆتە فریام بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە و ئەوەی روویداوە ئاشکرای بکەم، ئەوان بۆیە ئێمەیان بردبووە ئەو سەحرا چۆڵ و هۆڵە و بۆیە بەو شەوە کەوتبوونە کوشتنی ئێمە و بەپەلە شۆفلّ دای دەپۆشین، دەیانویست لەخوایشی بشارنەوە چیان لەو هەموو خەڵکە کرد، بەلاّم دەمووت خوا منی بۆ ئەوە پاراستووە ئەو نهێنیە ئاشکرا بکەم، بۆیە سات لەدوای سات هەستم دەکرد هێزێکی شاراوە دێتە گیانمەوە و ورەو هێزم دەداتێ هەستم و بکەومەوەڕێ. سەیرێ ئاسمانم کرد هەمان ئەو ئەستێرانەم بینی کە هاوینان لە سەربانی خانووەکەمان لە ئاوایی تەماشام دەکردن، یەکە یەکە ئەستێرەکانم دەناسیەوە وەك ئەوەی هەست بکەم خەڵکێ ناسیاو دەبینم ئاوا دڵم پێی خۆش بوو، ئەگەر تینوێتی و برسێتیەکە زۆر ناڕەحەتیان نەکردایام ئەو لەحزەیە ئاسمان وا بردبومیە ناو خۆیەوە وام دەزانی لەماڵی خۆمانم.

هەستام دیاربوو یان ئیسراحەتێ باشم کردبوو، یان وەك ووتم خوا هێزو ورەیەکی تری پێبەخشیبووم، ئەمجارە بەگوڕو تینێکی ترەوە کەوتمەوە ڕێ. لە مردن ناترسام و سەرەتا جارێکی تر بەرەو لای تەقەکان کەوتمەوەڕێ هەندێ ڕۆیشتم وەك بڵێی سەرم لێتێکچووبوو مشاوەرەیەکی خۆمم کرد بۆ چی بچمەوە بۆلای تەقەکان، ئەی بۆ نەگەڕێم بۆ ئاوەدانیەك لە دوورەوە گوڵۆپم بینی هەستم کرد ئەو شوێنە ئاوەدانیە بەلاّم زۆر دوور بوو، گڵۆپەکان کزکز دەسوتان. هەندێ رامدەکرد و هەندێ خاوم دەکردەوە، جارێکیتر ترسی ئەوە دایگرتم کێ دەڵێ ئەو شوێنەی من بۆی

دەچم ئەویش هەر لایتی سەیارەو شۆفلّ نیە و لەوێش هەر گەنجی کورد ناکوژن، ماوەیەك ترس دایگرتمەوە و نائومێد بوومەوە لەوەی رزگارم بێت دەمووت دیارە خوا قسمەتی منی هێناوە بۆ ئێرە تا لێرە بمرم چۆن دەتوانم لە مردنێك راکەم کە خوا بڕیاری لێی داوە. ماوەیەك بە ووردی تەماشای لایتەکانم کرد زانیم ئەمە لایتی سەیارە نیە، چونکە کاتێ لە دوورەوەش تەماشای شوێنی گوولەباران کردنەکانم دەکرد هەستم پێدەکرد لایتەکان دەجولێن و دێن و دەچن، بەلاّم رووناکی ئەم لایتانە ناجولاّ بەوەیا وتم ئاوەدانیە. بۆیە بەرەو ئەوێ رۆیشتم.

بەرلەوەی بگەمە گلۆپەکان دەنگی سەگوەڕ پەیا بوو، عادەتەن سەگ لە دەوری ئاوایی و شارەکان هەیە، دلّم خۆش بوو کەواتا بە هەلّە نەهاتووم و ئەمە ئاوەدانیە، بەلاّم دەشترسام بەهۆی ئەوەی گیانم بەخوێنەوەیە سەگەکان پەلامارم بدەن، لە ترسا لەناو لمەکە خۆم تەپاوتل ئەدا تا خۆلّ خوێنەکەی لەشم داپۆشێت، بەلاّم بەهۆی ئەوەی هێشتا برینەکەی سمتم هەر خوێنی لێدەهات هەستم کرد ناتوانم خوێنەکە لەخۆم بکەمەوە، بۆنی خوێنەکەش بەجلەکانمەوە هەر نەدەڕۆیی بۆیە لەوە بێئومێد بووم و وتم پشت بەخوا من کە لەو هەموو گوللەیە رزگارم بووبێت دیارە خوا منی پاراستووە و ئەگەر مەیلی لێبێت لێرەش لەو سەگانە دەمپارێزێت. کەوتمەوەڕێ، هێشتا نزیکی گلۆپەکان نەبووبوومەوە تەماشامکرد تەلبەندەو سەربازگەیە، ئیتر دلّم بەجارێ داخورپا.

*** بەچی زانیت سەربازگەیە.؟**

– هەمووی تەلبەند کرابوو.

*** هیچ سەبازێکت بینی، یان هێمایەکی تر کە ئامازەبێت بۆ ئەوەی ئەمە سەربازگە بوو، یان تەنها لەبەر ئەوەی تەلبەند بوو هەستت کرد سەربازگەیە.؟**

– وەڵا سەربازم نەبینی، بەڵام دیار بوو مەعەسکەر بوو، چونکە لە دووری گڵۆپەکانەوە چواردەوری هەمووی تەلبەندکرابوو، بەوەیا زانیم.

*** ئەی کە دڵنیابووی سەربازگەیە بڕیاری چیتدا.؟**

– زۆر نائومێد بووم، رێگایەکی دوورم بڕیووە، تینوویێتی ئەوەندەی تر هیلاکی کردووم، بەڵام باوەڕم بەوە هەیە خوا مەلایکەی ناردبوو تا رێنوێنیم بکات، بە لێواری سیمەکەیا هەندێ تر رۆیشم لەولاترەوە هەندێ گڵۆپی تر دەرکەوتن بەڵام ئەمان کەمتر بوو، یان لە دوورەوە وا دیاربوو یاخود هەر چەند گڵۆپێك بوو، بەرەو ئەوێ چووم لێیان نزیك بوومەوە زانیم ئەمانەیان ماڵن و وەك بڵێی تەنیا ماڵەن، سێ خانوو بوو، بەرلەوەی بڕیار بدەم بچم بۆ ماڵەکان دانیشتم نەمدەزانی قیبلە لە کوێوەیە بەڵام

هەردوو ئەژنۆم نایە زەوی دەستم و سەرم بۆ ئاسمان بەرزکردەوە و کەوتمە پاڕانەوە خوایە مەزلومم دوعاکەم لێوەرگیت و رووبکەمە ماڵێکی باشیان، وەك ئەوەی یەکێك دەستم بگرێت و ئاراستەی دەرگای ئەو ماڵەم بۆ دەستنیشان بکات کە بۆی چووم، دام لە دەرگاکە کچێك دەرگاکەی کردەوە تەمەنی هەر 14 بۆ 15 ساڵان بوو، تەماشایەکی کردم کە پێم پەتیە و لەشم بەخوێن و خۆڵەوەیە، نازانم خوا نابووی لەدڵی چی، بێ ئەوەی هیچ پرسیارێکم لێبکات یان بترسێ بەم شەوە ئەم زەلامە خوێناوییە چیە دای لە دەرگا، بە عەرەبی فەرموی لێکردم بچمە ژوورەوە.

*** چیتکرد، بەدوایدا رۆیشتیت، یان چاوەڕێتکرد ئەو بچێتە ژورەوەو حاڵەکەی تۆ بۆ ماڵەوەیان باس بکات و تا بزانی گەورەی ماڵەکە چی بڕیارێك دەدات.؟**

– ناوەڵا هیچ چاوەڕێم نەکرد، بەدوای کچەکەدا بەرەو ژوورەوە رۆیشتم، چونکە ئەو کە دەرگاکەی کردەوە لێی نەپرسیم فەرموو چیت دەوێ، یان چاوەڕێی ئەوە بکات من پرسیارێ شتێك بکەم، ئەو یەکسەر فەرمووی لێکردم بۆ ئەوەی بچمە حەوشەوە و کاتێ من چوومە ناو حەوشەکە ئەو خۆی دەرگاکەی داخستەوە و کەوتە پێشم بەرەو ناوەرەی خانووەکە.

ئیتر وەك ئەوەی خوا دەرگای رەحمەتی لێکردبێتمەوە ئاوها بوو، بەو حاڵەوە و لەو بیابانە و لە نزیك مەعەسکەرێك دوسێ ماڵێك لەوێ بێت، هەر خوا بۆ ئەوە رێی منی خستبووە ئەوێ تا ئەوانە ببنە فریشتەی رزگارکردنی من.

کاتێ کچەکە دەرگای ئەو ژورەی کردەوە کە ئیشارەتی کرد من بچمە ژورەوە، لەوە دەچوو هەموو خێزانەکە چاوەڕێی ئەوەبن کە لە دەرگاکەیان دراوە میوانێکە و دێتە ژورەوە، چونکە هەمویان لەو ژوورە دانیشتبوون و خێزانێکی قەرەباڵغ بوون. کە منیان بینی لەسەرو چاویاندا هەستم پێکرد حەپەسان هەموویان چاویان تێبڕیم، رەنگە قەت تەسەوریان نەکردبێت شەوێك کەسێکی وەك من بەجلوبەرگی خوێناوی و لەشێکی ماندویی خۆڵاویەوە رووبکاتە ماڵیان، هەموویان هەستانە سەرپێ و فەرمویان لێکردم بچمە ناویان. منیش سڵاوم لێکردن و چوومە ژوورەوە، دانیشتم سەرەتا هەندێ ئاویان بۆ هێنام و پیاوێکی بەتەمەن کە لەوە دەچوو سەرگەورەی خێزانەکە بووبێت بە ژن و مناڵەکانی ووت بچنە ئەودیوو، ئیشارەتی بۆ کردن ژوورەکە چۆڵ کەن. پاشان لێمیپرسی نانت نەخواردووە.؟ منیش پێم وت نەوەڵا دوو رۆژە هیچم نەخواردووە، داوای کرد چاو نانم بۆ بێنن. داوای لێکردم سەروچاوم بشۆم، هەر لە لێواری حەوشەکەیان و لەبەردەم ژوورەکە لە سەتڵێکا هەندێ ئاویان هێناو منیش دەست و دەم و چاو و پێیەکانم شۆرد کە هەمووی خوێنی

پێوە بوو. ئەوەنەی پێنەچوو هەندێ خواردن و چایان هێنا و پاشان لێی پرسیم چیت بەسەر هاتووە.؟

سەرەتا ئەو کاتەی چووەمە ژورەوەو کاتێ بینیم زۆر قەرەباڵغن، ترسی ئەوەم هەبو ئەگەر راستیەکە بڵێم رەنگە ئەم هەموو ژن و منداڵە لای ماڵەکانی تر بیگێڕنەوەو بەهۆیەوە ئاشکرابم.

دەمویست شتێك حازرکەم و درۆیەك بدۆزمەوە. بەڵام کە نان و چایان بۆ هێنام و خزمەتیانکردم هەستم کرد ئەم ماڵە ئینسانی چاکن و ئەگەر خراپ بووایان هەر نەیان دەهێشت بەو حاڵەوە بچمەماڵیان، بەتایبەت هەر یەکەم دیمەن بە جلوبەرگەکەم زانین کە من کوردم، بۆیە بڕیارمدا ئەوەی روویداوە بۆیان باس بکەم و راستیەکەیان پێ بڵێم، کاتێ کەوتمە گێڕانەوەی راستیەکە، هەستم کرد زۆر نیگەران بوون و دیار بوو زۆر بەزەییان پێما هاتەوە، بیرم کردەوە بۆ ئەوەی زۆرتر سەرنجیان راکێشم یەك درۆیەکم کرد ووتم خەڵکی ناوچەی قادرکەرەمین و لە گوندەکەی خۆمان دەژیایین جەیش هات هەموومانی گرتووە و راستەوخۆ هێنامانیان بۆ نزیکی ئەم شوێنە هەموو ژن و منداڵ و زەلام ئاواییەکە پێکەوە گوللەبارانمانیان کرد. ئێستا من بەتەنها رزگارم بووە خێزانەکەم و منداڵەکانم و خوشك و دایك و برا و هەموو کەسوکارەکەم تیاچوون و بۆ خوا هاوکاریم بکەن من رزگار بکەن، هیچ شوێنێك نازانم و ناشزانم ئێرە کوێیە. دیاربوو قسەکانم زۆر ئازاریدان و هەستیانی جوڵاند بۆ ئەوەی هاوکاریم بکەن. ئەمجارە پیاوەکە و ژنێکیان بردمیانە ژورێکی تر پاك

برینەکەمیان شۆرد و کەوتنە تەداوی کردنم، بە پەرۆ هەموو شوێنی برینەکەیان وشك کردەوە و بەپۆن چەوریان کرد بۆم، هەندێ دڵمیان دایەوە و وتیان هیچ نیە زامەکەت زۆر قوڵ نیە تەنها رووشاوە، خەمت نەبێت ئێمە یارمەتیت دەدەین تا دەگەیتەوە وڵاتی خۆت.

چونکە زۆر هیلاك و ماندوو بووم و دوای ئەوەی ئەو تەداویەیان بۆمکرد و برسێتی و تینوێتیم نەما و ترسەکەشم بەوە رەوەییەوە کە وتیان یارمەتیت دەدەین ئیتر خەوم لێکەوت، کاتێ خەبەرم بووەوە نزیك چێشتەنگاو بوو، نازانم شەو کەی بوو گەیشتمە ئەو ماڵە، بەڵام بەگوێرەی ئەوەی نەخەوتبوون دیار بوو زۆر درەنگ نەبوو. لەوکاتەوە کە خەوم لێکەوت تا خەبەرم بووەوە ئەوەندە هیلاك بووم رەنگە لەشوێنی خۆم نەجوڵابم. کاتێ هەستام بینیم وا جگەریان بۆ برژاندووم وتیان خوێنت زۆر لێرۆیشتووە جگەر بخۆ بۆتۆ باشە، بەوەیا دڵنیا بووم ئەم ماڵە خوا ناوێتی لە دڵیان من لە دەستی مردن رزگار بکەن، ئیتر ئەوەنەی تر هیوام بۆ گەڕایەوە

کورێکیان جلی سەربازی لەبەر بوو، کە سەرەتا هاتە حەوشەوە خەریك بوو رۆحم دەرچێت و وا هەستمکرد ئیخباریان کردووم و بۆ گرتنی من هاتووە، بەڵام کابرای خاوەن ماڵ کە دیاربوو هەر بە روخساری مندا ئەو ترسەی خوێندەوە، پێمی ووت مەترسە ئەمە کوڕمە بۆ لای تۆ هاتووە، لەوە دەچوو هەر لەو نزیکە سەرباز بووبێت، یان رەنگە جەیش شەعبی بووبێت لەو تەلبەندەی نزیکی ماڵەکانیان. ئەویش هات و وەك

ئەندامانی تری خێزانەکە پەرۆشی پێوە دیاربوو بۆ چارەسەرکردنم و یارمەتیدانم. ئەویش هەندێ پرسیاری لێمکرد و هەوڵمدا بەو عەرەبیە شەق و شڕەی خۆم قسەکانی شەو دووبارە بکەمەوە، لە وەڵامەکانی مندا ئەسەفی خۆی دەربڕی بۆ ئەو کارەساتەی بەسەرمدا هاتووە ووتی خوا گەورەیە و ئیتر ئەو رۆیشت.

* **کاتێک رۆیشت هیچ گومانێکت لا دروست نەبوو، کە رەنگە خەبەرت لێبدات.؟**

– وەڵا لە راستیا دەترسام، چۆن ناترسام. بەتایبەت ئەوەم لێك دەدایەوە کە ئەگەر بەهەر هۆیەکی ترەوە من لەم ماڵەیا ئاشکرابم رەنگە حکومەت هەموو ئەم خێزانە بکوژێت، ئەمووت کێ ئەڵێت لەترسی ژیانی خۆیان ناچن بمدەنە دەستەوە، بۆیە گومانم لە هەموو شتێك هەبوو. بەڵام ئەوەنەی پێنەچوو کاتێك هاتەوە (سستەرێك)ی لەگەڵ خۆی هێنابوو بۆ تەداوی کردنم، ئیتر گومانم نەما کە ئەگەر نیازیان خراپ بوایا ناچوون (سستەر) بێنن بۆ چارەسەرکردنم.

* **ماوەی چەنێکی پێچوو کاتێک رۆیشت، تا گەڕایەوە.؟**

– دیاربوو ئاوەدانی لێیانەوە نزیك بوو رەنگە هەر نیوسەعات کەمتریشی پێچووبێت.

* **ئەی ئەمجارە لەوە نەترسایت کە (سستەرەکە) ئیخباریت بکات.؟**

– وەك ترسی ئیخباری ئەو ترسەم نەما، تەواو دڵنیا بووم لەوەی ئەم خێزانە مەبەستیانە من رزگار بکەن، بەڵام لەوە دەترسام ئەگەر (سستەرەکە) پرسیارم لێبکات بۆچی وات بەسەر هاتووە، من چی بڵێم ئایا ئەوەی بەسەرم هاتووە بۆ ئەویشی بگێڕمەوە، یان دەترسام ئەگەر قسەیەکی تر بکەم، کێ دەڵێت ئەمان خۆیان راستیەکەیان پێ نەوتووە. بۆیە لای خۆمەوە بڕیارمدا ووتم ئەگەر هەر پرسیارێك بکات ئەڵێم هیچ عەرەبی نازانم.

* **جا هیچ پرسیارێکی لەو بارەیەوە کرد کە بۆ برینداربوویت.؟**

– نەخێر، لەوە دەچوو یان ناسیاری خۆیان بووبێت و راستیەکەیان بۆ باس کردبێت، یان ئەگەر ناسیاری خۆشیان نەبووبێت شتێکی تریان پێ وتبێت کە قەناعەتی کردبێت. بەڵام بەگوێرەی ئەوەی هیچ پرسیاری لەمن نەکرد قەناعەتم وایە کە پێشتر قسەیان لەگەڵ کردووە کە حاڵەتێکی وایە و بۆیە ئەویش کەوتە چارەسەرکردنم بێ ئەوەی قسە لەگەڵ من بکات. برینەکەی بۆ پاککردمەوە و داو دەرمانی پێبوو تەداوی کرد و رۆیشت.

بۆ نیوەڕۆ ژنی ئەو ماڵەی لێی بووم ووتی لێرە هەندێ ماڵە کورد هەیە، یەکێکیان زۆر دۆستی ئێمەیە بانگی بکەین بۆلات.؟ من کەمێك عەرەبیم دەزانی و بەشی ئەوە هەبوو بتوانم بەرانبەرەکەم تێبگەیەنم وە تێگەیشتنکەیشم باشتر بوو لەوەی کە قسەی بکەم، بەڵام کاتێ ئەو قسەیەی کرد وا هەستمکرد رەنگە من خراپ حاڵی بووبووم، لەوە دەچوو بۆ من جێی باوەڕ نەبێت لەم بیابانە ماڵە کورد چی دەکات لێرە، بۆیە یەك دووجار قسەکەم پێ دووبارە کردەوە کە ئایا ماڵی کورد لێرەیە.؟ ئەو دەیووت ئا، زۆرن بەڵام یەکێکیان ناوی (ئەمین)ە دۆستی ئێمەیە، بچم بیهێنم. دەیویست خۆم رەزامەندیم لەسەربێت کە بیهێنێت بۆ بینینی من. زۆر بەلامەوە سەیر بوو کورد چی دەکات لێرە، هەر لەوە دەچوو خوا هەموو ئەم شتانەی لەپێناو ئەوەدا کردبێت تا من رزگاربم، زۆر بە پەرۆیشیەوە داوامکرد کوردەکە بێنن. کوڕێکی مێردمناڵیان هەبوو ناردیان و ئەوەنەی پێنەچوو لەگەڵ کابرایەکدا هاتەوە شەرواڵێکی کوردی لەپێبوو سەرەوەش لەباتی مراخانی چاکەتێکی لەبەر بوو هاتنە ژوورەوە، من لەبەر ئەوەی پێشتر تەداوییان کردبووم لەسەرلا راکشابووم بەڵام وەك ئەوەی بمەوێ لەبەری هەستم و ئەویش بزانێ کە ناتوانم بۆیە دانیشتم، ئەویش کاتێ منی لەو ماڵە بینی دیار بوو پەشۆکا، کابرای خاوەن ماڵ و ژنەکە هەندێ قسەیان لەگەڵ کرد و ئەوجا لەگەڵ من کەوتە قسەکردن. کەوتە پرسیاری ئەوەی خەڵکی کوێم و چیم بەسەرهاتووە. منیش لە ئەوەڵەوە چی روویداوە هەموویم بۆی گێڕایەوە. زۆر تێکچوو لەوە دەچوو

کە بترسێت بەم حاڵەوە کەوتومەتە ناو ئەمان و ئەگەر حکومەت بزانێ هەموویان رەمی دەکات. رووی کردە کابرای خاوەن ماڵ و ژنەکە و بە عەرەبی قسەکانی منی بۆیان گێڕایەوە. ئەوانیش لە سیمایاندا دەرکەوت کە شڵەژان و دیاربوو ترسیان لێنیشت. من بە حساب خۆم هەر شەو هەموو ئەم قسانەم بۆیان کردبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی عەرەبیکەم زۆر باش نەبوو، دیاربوو ئەوان هەموو ئەو شتانەی وتوومە تێنەگەیشتبوون و بەزەییان پێما هاتۆتەوە کە وتومە ژن و منداڵ هەمووی عەسکەری کوشتویەتی.

دیاربوو ئیتر مشەوەش بوون و هەستم کرد ئەوانیش ئەمجارە ترسی ئەوەیان لێنیشت کە ئەگەر حکومەت بەم حاڵە بزانێت، وەزعی ئەوانیش لە من خراپتر دەبێت. تێدەگەیشتم کە خەمی ئەوەیانە نابێ هیچ کەس بزانێت تا چارەسەرێکی بۆ دەدۆزینەوە، ئاگام لێبوو ژنەکە چووە ژوورەکەی تر و لەگەڵ کچ و ژنەکانی تر قسەی دەکرد، ئیتر لە سیمای هەموویاندا ئەو دڵە راوکێیەم دەبینی کە ئەوانیش وەك من دەترسن. بەڵام کەس نازانێ خێر هابەچییەوە کێ دەڵێ ئەگەر شەو تەواو تێبگەیشتنایا هەر شەو نەمیانئەکردە دەشتەوە، بەڵام تازە ئەوانیش وەك من پێوە بووبوون و خەمی ئەوەیان بوو بەسەلامەتی رزگارم بێت و نەکەومە دەست حکومەت.

* **لەو حاڵەتەدا کە هەستت بە نیگەرانی و ترسی ئەوانیش دەکرد، هەستت چۆن بوو.؟**

– وەلاّیی لە راستیا زۆر زۆر ناخۆش بوو، ئەوەی لەشەوەوە وەك ئومێدێك لام دروست بوو، لەگەڵ نائومێدبوونم ئەمجارە بەدەر لە ترسەکە، توشی ئیحراجیەکی زۆریش هاتم، ناخۆش بوو ئەگەر شتێ روویدات ئەم خێزانەش بەهۆی منەوە تیا بچن. خۆزگەم دەخواست کە هەر دەربازم نەبوایا و وەك هاوڕێکانم منیش رزگارم بوایا، چونکە هەندێجار مردن رزگاربوونە. بەس نەبێت ئەوان ئیتر مەینەتی تر ناچێژن، من لەوە دەترسام کە خۆشم نازانم چیم بەسەر دێت. لەو حاڵەتەدا مردن رزگاربوون بوو. بەلاّم ئێستا ئاشکرابوون و مردنی من دەبێتە هۆی تیاچوونی خێزانێ تر و رەنگە سستەرەکە و ئەم کابرا کوردەش هەموویان لەسەر ئەوەی بەم حاڵەی منیان زانیووە و خەبەریان نەداوە هەموویان ئیعدام بکرێن، بۆیە خۆزگەم دەخواست پێشتر یان وەك گوللەکە دای لە سمتم، بەر سەرم بکەوتایا و نەجاتم بوایا، یان هەر لە رێگە لای تەلبەندەکەی سەربازگەکە ئاشکرا بوایام و نەگەیشتمایا بەم ماڵە و قورپم نەکردایا بەسەر ئەمانیشدا. بۆیە هەستم بە شەرمەزاری دەکرد. بە کابرا کوردەکەم ووت تۆ دەتوانی چیم بۆ بکەیت، دەتوانی هاوکاریم بکەیت بگەمە دوزخورماتوو یان کەرکوك.؟ کابرا ووتی بەخوا ناتوانم هیچ هاوکاریەکت بکەم، پێش چەند مانگێك بوایا دەمتوانی، بەلاّم ئێستا ناتوانم هیچت بۆ بکەم.

* مەبەستی چی بوو لەوەی پێش چەند مانگێک بوایا دەیتوانی و ئێستا ناتوانێ هیچت بۆ بکات.؟

– منیش قسەکەیم بەلاوە سەیر بوو، زۆریش بێ ئومێد بووم بە وەلامەکەی. یەکەمجار ژنەکە وتی کورد لێرەیە و بانگی دەکەم، وا هەستم دەکرد خوا فریشتەی بۆم ناردووە، بەلأم کە هات و دوای ئەوەی قسەمان کرد، ئیتر تەواو نائومێد بووم و حەزم دەکرد ئەو زەویە شەق بەرێت و بچمە ناوییەوە، لەم نەهامەتیی و ناهەمواریەدا خوا ئەم کوردەی ناردووە کەچی هەر لەڕێوە هەموو دەرگایەکی بەڕووما داخست، وا هەستم دەکرد سەعات لە دوای سەعات لە مردنێکی ترسناك نزیك دەبمەوە. دەمزانی ئیتر مانەوەم بەم جۆرە باش نیە، چونکە بۆم دەرکەوت ماڵەکە ئێستا بەهۆی ئەم کابرا کوردەوە لە راستیەکە تێگەیشتوون نەك شەو لە قسەکانی خۆم، بۆیە کەوتمە پاڕانەوە لێی کە هەرچۆنێکە نائومێدم نەکات و یارمەتیم بدات بۆ گەڕانەوەم. بەلأم کاك ئەمین کە کەوتە باسی حاڵ و گوزەرانی خۆیان ئەوکات تێگەیشتم کە ناهەقی نەبوو، چونکە ئەو خۆی کوردی ئێران بووە و بەهۆی شەڕی ئێران و عیراقەوە ناوچەکەیان کەوتبووە ژێردەستی سوپای عیراقەوە و گوێزرابوونەوە بۆ نزیك رومادی لەوێ لە کەمپێکدا دەژیان. ووتی پێشتر بە ئاسانی هاتووچۆمان هەبوو بۆ

رومادی و بۆ کاروکەسابەت دەچوینە شارەکان، بەلآم ئێستا ماوەیەکە خۆشمان رۆژانە بۆ کرینی پێداویستی و نەخۆشی و هەرشتێك بێت تا رومادی وەرەقەی رێگەپێدانمان بۆ دەکەن لە کەمپەکە دەرچین و ئەویش سەعاتمان بۆ دیاریکراوە کە دەبێ چوون و هاتنەوەمان چەند سەعاتمان پێبچێت. ئیتر تێگەیشتم کە راستەوخۆ ووتی ناتوانم هاوکاریت بکەم پەیوەندی بەوەوە هەبوو کە باسیکرد نەك ئەوەی هیچ سۆزێکی بۆ من نەبوبێت. هەرچەندە ئەو حاڵەتەی باسی کرد بۆمن هەر بێ هیوایی بوو چونکە ئەگەر وانەبوایا دەمووت رەنگە ووردە ووردە دڵی باش بێت و لەگەڵم بێت، بەلآم ئێستا تێگەیشتم کە بەهیچ جۆرێك ناتوانێ ئەو هاوکاریەم بکات کە من چاوەڕێم دەکرد. پێمی ووت خوا گەورەیە چەند رۆژێك لێرە بمێنەرەوە ئێرە شوێنێکی ئەمینە تا برینەکەت باش دەبێت و بزانین خوا دەرویەك ناکاتەوە بتنێرینەوە.

ئیتر ئەو رۆیی و ئەو رۆژە و شەویش بەو جۆرە مامەوە و هەر بە خەیاڵی ئەوەی رزگارم بێت هەزارو یەك داڵغەم دەکرد، تاوێ دڵی خۆمم خۆش دەکرد و ئیشەڵا دەگەمەوە کوردستان و کەسوکارم دەدۆزمەوە و دەچمەوە ناو ژن و مناڵەکانم، تاوێکی تر بێ هیوا دەبووم لەوەی رێگایەك هەبێت بۆ رزگاربوون و خۆمم دەهێنایەوە بەرچاو کە دەستگیر دەکرێم و

هەلاهەلام دەکەن چۆن رزگارم بووە لەوێ. بۆ بەیانی جارێکی تر ئەو کاك ئەمینە هاتەوە بۆلام و هەندێ دڵی دامەوە و لەگەڵ کابرای خاوەن ماڵ کەوتنەوە قسەکردن چۆن مشورێك لە من بخۆن و رێگایەك بدۆزنەوە من بگەمەوە کەرکوك. کورە سەربازەکەش یەك دوو جار هات و چوو، تێگەیشتم لەوەی ماڵەکەش ئێستا شپرزەی ئەوەن زوو من لەکۆڵ خۆیان بکەنەوە نەوەك ئاشکرابم و ئەوانیش تیابچن، بەوەیا دڵم خۆش بوو ئەمووت لەترسی ئەوەی ئەگەر ئاشکرا بم ئەوانیش لەمن خراپتریان بەسەردێت بۆیە تا پێیان بکرێت هەوڵ دەدەن یارمەتیم بدەن رزگارم بێت، چونکە تازە من بوومە بەڵایەك بەسەر ئەوانیشەوە. بە هاتووچۆکردنەکەیان هەستم دەکرد دەیانەوێ رێوشوێنی رزگاریم بۆ بدۆزنەوە. ئیتر منیش کەوتبوومە خەیاڵی ژن و منداڵ و دایکم و براو خوشك و کەسوکارەوە و تا دەهات دڵم تەنگتر دەبوو تامەزرۆی گەڕانەوەم زۆرتر دەبوو.

بزانە خوا بیەوێ هەرشتێ بێنێتە رێت، دوو رۆژ لەمەوپێش بەرێگاوەبووین بۆ مردن و لەسەر دەستی کۆمەڵێك چەکداری عەرەب یەکەیەکە روحمانیان دەردەهێنا، لە خەیاڵی کەسدا نەبوو جارێکیتر چاومان بە دونیای رۆشن بکەوێتەوە، ئەوە ئێستا من بەو جۆرە لە مردن رزگارم بووەو خێزانێکی عەرەب بەدوای ئەوەدا دەگەڕێن چۆن من لە دەستی

حکومەت رزگار بکەن. ئەو رۆژەیش بەو جۆرە مامەوە و ئەوانیش هەر بەیەکدا دەهاتن. دوای عەسر کابرای خاوەن ماڵ هاتەوە لام دانیشت بەر لەوەی ئەو قسە بکات یان چاوەڕێ بکەم بزانم دەیەوێ شتێك بڵێت، جارێکی تر کەوتمەوە پاڕانەوە کە بمگەیەننەوە کەرکوك.

کابراکە پێمی ووت خەمت نەبێت پشت بەخوا رزگار دەبێت، من ئێستا کوڕەکەمت لەگەڵ دەنێرم تا بەغداد و لەوێشەوە ئیتر ئاسانە خۆت بچۆرەوە بۆ کەرکوك. داوایکرد ئەو جلانە بێنن، (دزداشەیەك و جامانەیەکی سور و جوتێ نەعلیان هێنا)، پێمی ووت ئەمانە بکەرە بەرت. من پێشتر جلی کوردیم لەبەر بوو جلەکانم داکەند و بە بەرچاوی ئەوەوە لەناو دەرپێ کوڵەکەم (کە لە تۆپزاوا جنسیە نفوسەکەم شاردبۆوە) دەرم هێنا و خستمە گیرفانی دزداشەکە. دیاربوو کابرای خاوەن ماڵ زانی جگە لەو جنسێیە هیچم پێ نیە، دەستی کردە گیرفانیدا و پێنج دیناریشی داپێم ووتی ئەوە بۆ تەکسی و کرێی رێگات لە بەغداوە بۆ کەرکوك. هەستم کرد دیارە تا بەغدا بەسەیارەی خۆیان دەمبەن. کوڕەکەی هاتەوە و وتی بابڕۆین، ئیتر ژن و مناڵەکانیان وەك ئەوەی کەسی خۆیان بم تا لای سەیارەکە بەڕێمیان کردو وتیان خوا ئاگادارتان بێت.

*** جۆری سەیارەکە چی بوو.؟**

- پیکابێکی سپی تاك بوو.

* سایەقەکە هەمان کوڕی ماڵەکە بوو، یان ئەویش لەگەڵت هات و سەیارەکە سایەقی خۆی هەبوو.؟

– نا، وا هەست دەکەم سەیارەکە هی خۆیان بووبێت، چونکە ئەم دوو ڕۆژە ئەو کوڕەیان هەر هاتوچۆی پێدەکرد. کوڕەکە سەیارەکەی لێدەخوڕی و منیان خستە نێوان خۆی و باوکیەوە. سەرەتا من واتێگەیشتم باوکی نایات لەگەڵم چونکە واحاڵی بووم کە ووتی کوڕەکەم دەنێرم لەگەڵت تا بەغدا، بەڵام کە سواری سەیارەکە بووین خۆشی سوار بوو لەگەڵمان، لە دڵی خۆمدا ووتم بەخوا تەڕ عەرەبی دەزانم شەوی یەکەم بەحساب خۆم هەموو شتێکم تێگەیاندون گیان بە کاك ئەمین بوو پەیابوو حاڵەکەی بۆ باسکردن، ئەگینا ڕەنگە هەر نەیانزانیایا چیم لێیان دەوێ و ئەوەتا ئێستاش وامزانی کابرا دەڵێت من نایەم کوڕەکەم دێت کەچی خۆیشی هات لەگەڵم ئیتر بەو هۆیەوە زیاتر هەستم بە دڵنیایی دەکرد کە باوکیشی لەگەڵم بێت.

* سایەقەکە جلی چی لەبەر بوو.؟

– جلەکەی عەسکەری بوو، بەڵام نەمزانی عەسکەر بوو یان جەیش شەعبی. دەزانم دەوامەکەی زۆر نزیکی ئەو شوێنەبوو کە ماڵیانی لێبوو

چونکە ئەو چەند ڕۆژەی من لە ماڵیان بووم ڕەنگە شەش حەوت جار چوبێتە دەوام و گەڕابێتەوە، زوو زوو دەڕۆیشت و دەهاتەوە.

* **لێت نەپرسین ئەو شوێنە کوێ یە.؟**

– ئەوان تەنیا ماڵە بوون نەمووت هەر سێ ماڵ بوو. بەڵام وتیان نزیکی بەخوا ئەگەر هەڵە نەبم وابزانم (ئاڵتاش) یان ووت.

* **کاتەکەی کەی بوو لەوشوێنە بەڕێکەوتن.؟**

– وەڵا بە سەعات نازانم، بەڵام دەمەو ئێوارە بوو.

* **دووری ئەو شوێنە تا بەغداد بەو سەیارەیە چەنێک دەبوو، ئەگەر هەست بکەیت کاتەکەی کەی بو کە گەیشتنە بەغداد.؟**

– وەڵا ئەوە نازانم، چونکە یەکسەر نەهات بۆ بەغدا و لە ڕومادی خستمیانە سەیارەی ترەوە.

* **بۆ.؟ هیچ حاڵەتێک ڕوویدا تا سەیارە بگۆڕن.؟**

– نەخێر هیچ رووی نەدا، دیاربوو ئەوان خۆیان ئاوا بەرنامەکەیان دانابوو. ئەو شوێنەی ماڵی ئەوانی لێبوو نزیك بوو لە ڕومادیەوە، بە

پیکابەکە تا رومادی هاتین و چووینە گەراجی بەغدا، لەوێ دابەزین قەمەرەیەکی سپی خسوسی سێ نەقیبی عەسکەری تیابوو چاوەڕێی دەکردین کابرا خواحافیزی لێکردین و ئەو بە پیکابەکە گەڕایەوە، من و کوڕەکەی سواری ئەو سەیارەیە بووین. سەرەتا دڵم کەوتە مشکیلەوە رەنگ ئەمە پیلان بێت و ویستبێتیان بەو جۆرە تەسلیمم بکەن، بۆچی لە گەراج سەیارەی خسوسی لێیە، بۆچی لەگەڵ ئەم نەقیبی عەسکەریانە سەرمدەخەن. بەڵام کاتێ سەرکەوتین بە شێوازی مامەڵە و قسەکردنیان پێکەوە لەوە حاڵی بووم کە ئەمانە خزم و ناسیاری یەکترن.

*** بەچی هەستت پێکرد، هیچ شتێکت گوێ لێبوو لە ناوهێنانیان یان لە قسەکردنەکەیا بۆنموونە هەست بکەی مام و برازا، یان یەکیان بە یەکیان بڵێت خاڵۆ، یان هەر ئامازەیەکی تر.؟**

– وەك ئەوە نەوەڵا، بەڵام بەچەند شتێك ئەو هەستەم لادروست بوو، ئەوان لە سەیارەی خۆیانا بوون و چاوەڕێکردنەکەیان دیاربوو ئەم کوڕەیان دەناسی، کاتێکیش کە سەرکەوتین شێوەی مامەڵەکردنیان وەك ئەوە نەبوو ئەمانە بەرێککەوت لە سەیارەیەکدا یەکیان بینیبێت، گاڵتەو قسەکردنیان لەوەش ناچوو عەسکەرێك لەگەڵ نەقیبێك بێت، وەك برادەر وابوون.

***  نەقیبەکان هیچ پرسیارێکیان لە تۆ نەکرد.؟**

– هەر ئەوکاتەی سەرکەوتین یەکەمجار بەخێرهاتنمیان کرد، ئیتر تا گەیشتینە بەغدا هیچ قسەیەکیان لەگەڵ من نەکرد.

***  ڕێگای نێوان بەغدا بۆ ڕومادی هیچ سەیتەرە یان مەفرەزەیەکی پشکنین نەهاتە ڕێگەتان.؟**

– بەڵێ لێی بوو، وابزانم سێ بوو ئەگەر چوار بوو سەیتەرە هەبوو، لە یەکەم سەیتەرە زۆر ترسام ووتم ئێستا لەناو ئەم سەیارەیە تەنها کەسم کە جلی مەدەنی لەبەرمە و ئەوانی تر سێ نەقیب و عەسکەرێ بە دڵنیاییەوە یەکسەر داوای هەویەم لێدەکەن و دەمگرن.

***  تۆ جنسێت پێبوو ئیتر بۆ دەترسایت بتگرن.؟**

– ئاخر کاتی خۆی من مەوالیدم هاتبۆوە بۆ سەربازی و نەچووبوومە پێشەوە بۆ عەسکەری هەر (موتەخەلیف) بووم.

***  باشە خۆ لە جنسێکەت نەنوسرابوو ئەمە نەچۆتە پێشەوە بۆ سەربازی، بەچی دەیانزانی لموتەخەلیفیتا.؟**

– ئەی چۆن نەیاندەزانی، مەوالیدەکەم کرابووە عەسکەر، ئێ من ئەگەر عەسکەریم دەبوو دەفتەرخدمەم هەبێت و هەویەی عەسکەری و من هیچ ئەوانەم نەبوو.

*** کاتێ گەیشتنە سەیتەرەکە داوای جنسێیان لێکردیت.؟**

– هەر رامانیان نەگرت، سەیارەکە کەمێك خاوی کردەوە و ئەوان سڵاویان بۆ ئێمە کرد و ئیتر رۆیشتین. دیار بوو هەر ئەوکاتەی نزیکی سەیتەرەکە بووینەوە ئەوان بینیان نەقیبێك سەیارەکە لێدەخوڕێت و یەکێ تر لە پێشەوە، یەکسەر سڵاوێکی عەسکەریان بۆمانکرد و رزگارمان بوو. تا گەیشتینە بەغدا لە سەیتەرەکانی تریش هەر بەو شێوەیە بوو، چونکە ئەوان خۆیان عەسکەری بوون و تەنها کەس لەناویاندا من بووم کە جلی مەدەنی لەبەرم بوو کێ دەڵێت بەهۆی ئەوەی جامانەی سوور و دزداشەم لەبەر بوو لەگەڵ ئەو نەقیبانەدا، رەنگە سەیتەرەکان وایانزانیبێت منیش نەقیب و شتم. یەکەمجار کە سەرکەوتین تا دەدەقەیەکیش هەر دەترسام و واهەستم دەکرد لەناو ئەو سەرباز و ئەفسەرانەم کە گوللەبارانمانیان کرد، چونکە لە قادرکەرەمەوە تا ناو ئەم سەیارەیە هەموو ئەو عەسکەرییانەی بینیانمان هەموویان لەبەر چاوی من هەر لەیەك دەچوون، بەڵام کاتێ ترسەکەم گۆڕا بۆ ئومید ئەویش دوای

ئەوەی دڵنیا بووم کە ئەمە پیلان نیە بۆ بەدەستەوەدانی من و بەپێچەوانەوە بەرنامەیەك بوو تا من بەسەلامەتی بگەیەننە بەغدا، بەتایبەتیش دوای ئەوەی یەکەم سەیتەرەمان بڕی، بۆیە خۆزگەم دەخواست نەك تا بەغدا، بەڵکوو تا کەرکوك لەگەڵ ئەم سەیارەیە بومایا.

* کەی گەیشتنە بەغدا.؟

— کاتەکەی نازانم، بەڵام شەو بوو. دیاربوو ئەوان خۆیان بەرنامەکەیان بەو جۆرە دانابوو کە شەو بگەینە بەغدا. لە شوێنێك راوەستا نازانم کوێ بوو کۆمەڵێك تەکسی لێبوو دایانگرتم بەڵام پێمیان ووت سواری تەکسی بەو بە تەکسیەکە بڵێ بۆ گراج نەهزە. دابەزیم خواحافیزیم لەوانکرد و سواری یەکێ لەو تەکسیانە بووم کە لە قەراغی شەقامەکە راوەستابوون، بۆمن مایەی مەترسیەکی گەورە بوو، ئەمە یەکەم ئاوەدانی بوو بەو جۆرە ببینم، پێشتر کاتێ گەیشتینە گەراج رومادی دووکەسم لەگەڵ بوو سەیارەیەکش چاوەڕێی دەکردین بەڵام ئێستا گەڕاومەتەوە ناو ئاوەدانی و هیچ کەسێکم لەگەڵ نیە کە بەهۆیەوە هەست بە دڵنیایی بکەم. بە دزداشەیەکی سپی و جامانەیەکی سور و جوتێ نەعل و پێنج دینار و جنسێیەکەوە سواری تاکسیەکە بووم و پێم ووت بۆ گەراج (نەهزە).

*** تۆ پێشتر هیچ جارێک بەغدات بینیبوو.؟**

- بەڵێ بینیبووم.

*** هیچ ماڵێکی ناسیار، یان کەسێکت نەدەناسی کە لە بەغدا پەنای بۆ بەریت هاوکاریت بکات بۆ گەڕانەوەت بۆ کەرکوک.؟**

- نەخێر کەسم شك نەئەبرد، ئەگەر ناسیاریشی لێبوایا، من هەرگیز نەمدەتونی بیدۆزمەوە، چونکە هیچ شوێنێکم نەدەزانی شارەزا نەبووم.

*** زۆرجار لەناو شارەکان مەفرەزە دادەنرا، لەو شوێنەی سواری تەکسیەکە بوویت تا گەراج نەهزە، هیچ مەفرەزەیەك نەهاتە رێتان.؟**

- نەخێر سەیتەرە و مەفرەزەمان توش نەبوو، بەڵام زۆر ئەترسام، لەبەر خۆمەوە ئەمووت کێ ئەڵێت ئێستا نەقیبەکان دوای ئەوەی منیان دابەزاند و راوەستان تا سواری تەکسیەکە بووم، ئیخباریان نەکردووم، واهەستم ئەکرد بەدوامدا دەگەڕێن. بەڵام دڵی خۆمم بەوە ئەدایەوە ئەگەر ئەوان مەبەستیان بوایا دەیانتوانی خۆیان بمگرن و بمبەن تەسلیمم بکەن. خۆشمم حازر کردبوو ئەگەر توشی مەفرەزە بووین و پرسیاریان لێمکرد

چی دەکەم لێرە، بڵێم کرێکاری دەکەم. باش بوو هیچ نەهاتەڕێمان تا گەیشتینە گەراجی نەهزە. دابەزیم لە تەکسیەکە و چووم سواری کۆستەرێکی 21 نەفەری بووم کە لە شوێنێك راوەستابوو هاواریان دەکرد کەرکوك، کەرکوك. سەرکەوتم و بینیم ژمارەیەك جوندی و خەڵکی تری تیایەبەڵام هێشتا پاسەکە تەواو پڕنەبوو چاوەڕێی نەفەری تری دەکرد. رەنگە دەدەقە بۆ چارەکێکی پێچوو تا هەموو کورسیەکان پڕبوون. بەرلەوەی سایەقەکە بەڕێبکەوێت ئەمنێك هاتە ناو سەیارەکەوە داوای هەوییەی دەکرد، بەدیاریکراوی رووی نەکردە کەسێك بەڵام بە هەموومانی ووت (هەویاتکوم)، هەرکەس دەستیکرد بە گیرفانیا هەوێکەی دەرهێنا، زۆر ترسم لێنیشت کە هەویەکە بدەمە دەستی دەزانێ مەوالیدم هەمووی سەربازە و داوای دەفتەر خدمەم لێدەکات و ئاشکرا دەبم، بۆیە ئەوکاتەی تەماشای هەویەی ئەوانەی لای پێشەوەی دەکرد ویستم لە پاسەکە دابەزم، لەناو دەرگاکە پێشی گرتم و ووتی هەویەکەت. بەناچاری جنسیەکەم دایە دەستی و رەنگم تەواو تێکچووبوو، گرتمی و چەند نەفەرێکی تریش کە جنسیەکانی لای خۆی هێشتبووەوە بەوانیشی ووت دابەزن و دایگرتینە خوارەوە. ئیشارەتیکرد بۆ سوچێك بۆشاییەك بوو بچین لەوێ راوەستین، دیاربوو لەناو سەیارەی تریش کۆمەڵێك خەڵکیان بەو جۆرە داگرتبووە خوارەوەو ئەوانیش هەر لەوێ خڕکرابوون.

*** ئەمنەکە تەنها خۆی بوو، یان کەسیتری لەگەڵ بوو.؟**

– ئەوەی هاتە سەیارەکەوە تەنها خۆی بوو، بەڵام دیاربوو ئەمانە یان مەفرەزەبوون یان ئەمنی تایبەت بە گەراج بوون، کە دایگرتین چەند ئەمنێکی تر لە نزیکی سەیارەکان بوون و چەکداری حکومەت لەو ناوە زۆر بوو.

*** چەند کەس بوون ئەوانەی لەو شوێنە کۆکرانەوە.؟**

– بەو خوایە وابزانم 12 کەس بووین، من هەر موتەخەلیف بووم، بەڵام ئەوانی تر زۆریان جوندی بوون و بەبێ ئیجازە دابەزی بوون، دڵنیا نیم بەڵام وابزانم ئەیانووت (جمعەوخمیس) دابەزیوون.

*** چیان لێتاتکرد.؟**

– سەیارەیەکی لاندکرۆزەری مۆدیل 79ی سپییان هێناو سەرمانیانخست، لە گەراجی نەهزەوە بۆ شوێنێك بردمانیان وتیان (حارسیەی بەغدایە) دیاربوو جوندیەکان شارەزابوون.

*** ئەوکاتە هەستت چۆن بوو ئەوەی لێی ئەترسایت ئێستا روویدا.؟**

– وەڵا سەرەتا کە لە پاسەکە دایانگرتم زۆر زۆر ئەترسام واهەستم دەکرد ئێستا منیان ناسیووەتەوە و ئەوان هەموو شتێك لەبارەی منەوە دەزانن، بۆیە ئەگەر لەوێ تەحقیقیان لەگەڵم بکردایا رەنگە لەترسا هەموو شتێکم بووتایا، بەڵام کاتێ بردمانیانە (حارسیە) لەوێ خەڵکی تری زۆر گیرابوون و کوردیشی زۆر لێبوو، بەو هۆیەوە کەمێك هاتمەوە سەرخۆم.

*** ئەو کوردانەی تر چی بوون وا لەوێ گیرابوون.؟**

– هەبوو هەروا گیرابوو هیچی لە هیچا نەبوو، هەبوو جاش بوو گرتبویان، تەلەبەی تیابوو، سایەقی تیابوو. دیاربوو هەرکەسیان گرتبێ سەرەتا هێناویانە بۆ ئەوێ و لەوێوە ئیجرائاتی تریان لەگەڵ کراوە. ئەو شوێنە وەك بڵێی ئینزیباتخانە بوو، لەوێوە ناردمانیان بۆ تەسفیرات. ئیتر ئەوەی عەسکەر بوو لێرەوە بۆ وەحدەکەی خۆی، ئەوەی موتەخەلیف بوایا دەنێردرا بۆ تەجنید و بۆ سەوقی عەسکەری و ئەوەشی کێشەی نەبوایا لەوێ بەریان ئەدا.

من سێ رۆژ لەم شوێنە (حارسییە)ی بەغدا مامەوە، ئەو سێ رۆژە زۆر رەزالەت بوو نان و ئاویان نەئەدا پێمان، حانووت هەبوو دەبوو بە پارە بیکڕین، منیش ئەوەنە پارەم پێنەبوو سێ چوار دینارێك بوو بە حساب خۆم هەڵمگرتبوو بۆ کرێی رێگا بۆ گەیشتنەوەم بە کەرکوك.

تەعزیبێکی زۆریان داین، هەروا لە ناکاو کۆمەڵێك قامچی بەدەست دەهاتن و دەکەوتنە سەروگوێلاکی ئەو خەڵکە. زۆر ناخۆش بوو، بۆ من ترسناکتر بوو لە قاعەکانی تۆپزاوا و ئەمووت کێ دەڵێ لێرەوە جارێکیتر هەمان پەتپەتیم بەسەرنایات و بە کۆمەڵێك عەزاب و نارەحەتی ترەوە نامبەن لە شوێنێکی تر گوولەبارانم ناکەن. بڕوا بکەن ئەوەنە ناخۆش و ترسناك بوو ئەگەر ئەو کاتەی لە شوێنی کوشتنەکەمان لە نزیك روومادی کە رزگارم بوو بمزانیایا توشی ئەم دەردە دەبوومەوە، ئەو کاتەی لە سەیارەکە دابەزیم خۆم هاوارم دەکرد بۆ سەربازەکان وەرن بمکوژن من هێشتا زیندووم.

ئەو سێ رۆژە ئەوەنە ئومێدی رزگار بوونم لا دروست بووبوو، ئەوەنە بەهیواوە چاوەرێ بووم بگەمەوە ناو کەسوکارم، بۆیە کاتێ جارێکیتر دەستگیر کرامەوە بەجارێ داڕوخام و هیچ هیواو ئومێدێکم بە ژیان نەمایەوە، خوا خوام بوو زوتر بمکوژن و نەگەمە ئەوەی مەینەتی زیاتر نەبینم. ئەو سجنە هەمان دیمەنی ناو سەیارە سەرداپۆشراوەکەی نێوان تۆپزاوا بۆ بیابانەکانی رومادی دەهێنایەوە بەرچاوم، دەبوو هەر لەناو ژورەکە میزو پیسایی بکەین و بە ئیسفنج هەڵیبمژین بۆ ناو بەرمیلێك، ئەوان ئەوەیان هەر بۆ تەعزیبی نەفسی ئێمە دەکرد، بڕوا بکەن هەر بۆن و پیسی خەریك بوو رۆحمان دەرکات. ئەمووت خوایە گیان ئاخر من لە ژیاندا چی گوناحێکم کردووە تا ئەو سزایە بچێژم.

دوای ئەو سێ ڕۆژە گواسترامەوە بۆ تەسفیرات هەر لە بەغداو ماوەی یەك مانگ لەوێ هێڵدرامەوە. پڕی بوو لە سجن، خواردن بە پارە بوو، من هیچ پارەیەکم پێ نەمابوو بەخوا بەرماوەی خەڵکم دەخوارد، ژیانی ئەو ماوەیەم هەم لە ڕووی جەستەییەوە پڕ ئازار بوو، هەم لە ڕووی دەروونیی و روحیشەوە، چونکە دەمویست بگەمەوە ناو خێزان و کەسوکارەکەم و ئەوان بزانن من ماوم، دەمویست ئەو سرەی لە دڵمابوو بە کەسێك بڵێم من دەزانم چۆن ئەو هەموو گەنجەی کوردیان کوشت.

*** کاتێ ئەو کوردانەی تر کە لە سجن بینیانت و بەدڵنیاییەوە پرسیارتان لەیەکتری کردووە چۆن و بۆچی گیراوویت، هیچت بۆ نەگێڕانەوە لەبارەی بەکۆمەڵکوشتنی گەنجەکان و ئەوەی بینیبووت.؟**

– نەخێر، تەنها ووتم بۆ کرێکاری هاتووم بۆ بەغداو دەستگیر کراوم. نەمدەوێرا، چۆن بتوانم زانیاریەکی ئاوا ترسناك باس بکەم، کێ دەڵێ لەوماڵەی نزیك رومادی دوای ئەوەی من رزگارم بووە، ئێستا حکومەت نەیزانیووەو دونیا بەشوێن مندا ناگەڕێت. لەبەر ئەوە دەمویست بەخەیاڵیش نەگەڕێمەوە بۆ ئەو دیمەنانە.

*** ئەی ئەو شوێنانەی لێی سجن بوویت، ئەوان هیچ تەحقیقێکیان لەگەڵت نەکرد، لەکوێوە هاتبووی بۆکوێ دەچوویت.؟**

– نەخێرن ئێستا مەلەفەکەی من لای ئەوان ئەوە بوو کە من نەچوومەتە پێشەوە بۆ ریزی سەربازی و ئیتر ئەو رێوشوێنانەیان دەگرتەبەر کە بمکەن بە عەسکەر. لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵکیتردا بە سجنی ناردمانیان بۆ ئینزیباتخانەی کەرکوك، ئەو شوێنەی کە خۆم دەمویست بۆی بگەڕێمەوە. لەناو ئەوانەدا کوڕێکم ناسیەوە کە پێشتر یەکتریمان دەناسی ناوی (دیلمان) بوو خەڵکی (تۆمەر سۆفی) بوو لەناو (داوێ). لێم پرسی چۆن گیراوە، ئەو شوان بوو لای مەڕ بوو گرتبویان مەڕەکەیان بردبوو خۆشیان بەسجنی ناردبوو بۆ ئەوێ. ماوەی سێ رۆژ پێکەوە سجن بووین لە ئینزیباتخانەی کەرکوك، ئەویش هیچی نەدەزانی لەبارەی ئەو خەڵکەوە کە دەستگیر کرابوون و تەنها ئەوەی دەزانی کە بەسەر خۆیدا هاتبوو، هەواڵی خەڵکی ناوچەکە و ژن و منالم لێی پرسی، ئەویش خۆم ئاسایی ئاگای لە هیچی تر نەبوو تەنها ئەوە نەبێت کە بەسەر خۆماندا هاتبوو. لە سجنی ئینزیباتخانەی کەرکوك دەمویست هەواڵێکم دەستکەوێت، بەڵام کەس زانیاری نەبوو. دەمووت تەماشای قسمەت بکە، پێش ماوەیەك من جارێکی تر لەم شارە لە قاعەکانی تۆپزاوا سجن بووم،

بەڵام دەیانویست بمانبەن بۆ گوولەبارانکردن. ئێستا جارێکی تر بە سجنی گەڕێندراومەتەوە بۆ کەرکوك، بەڵام ئەمجارە دەیانەوێ سەوقم بکەن بۆ عەسکەری، کێ دەڵێ نامنێرن بۆ رومادی بۆ نزیك شوێنی بەکۆمەڵکوشتنی هاوڕێکانم، یان بۆ جەبهەیەکی شەڕی ئێران و عێراق و خوا رۆژی منی لەوێ تەواو کردبێت.

ئێمە لەبەر ئەوەی نفوسمان دوزخورماتوو بوو لەگەڵ ئەو کوڕە (دیلمان) پێکەوە گواستراینەوە بۆ دوزخورماتو، لەوێ تەحقیقیان لێمانکرد. کوڕەکە ووتی شوان بووینەو گیراوین براوین بۆ کەرکوك، ئیتر دیاربوو ئەوان وایانزانی بوو هەردوکمان هەر پێکەوە بەو جۆرە گیراوین هیچ پرسیارێکی تریان لێمان نەکرد و بۆ ماوەی 10 رۆژ بەو جۆرە هێشتمانیانەوە بە سجنی. من دەمزانی ئەگەر ئێستا بۆ یەك سەعات ئازادم بکەن لەم سجنە لە دوزخورماتوو هەواڵی دایکم و ژن و منداڵەکانم و کەسوکار دەزانم، بەڵام وا ئێستا لەناو چوار دیواردام و نە هیچ کەسێك بەوە دەزانن من ماوم لەژیان و نە منیش دەزانم ئەوان چیان بەسەر هاتووە.

ئێمە نازانین لە ماوەی ئەو دە رۆژەدا ئەوان کتاب و کتابکاری چیان لەسەر ئێمە کردبوو، بەڵام دوای دە رۆژ هەر بەسجنی و دەست بە کەلەپچەوە گواستمانیانەوە بۆ ئینزیباتخانەی (تکریت) گوایە سەوقمان دەکەن بۆ عەسکەری. ئێستا من بەوە مەمنون بووم بمکەن بە عەسکەر و

بتوانم بەو هۆیەوە بگەڕێمەوە بۆ هەواڵی کەسوکار و ماڵ و منالم، بەلام خەریك بوو دلم ئەتەقی لەداخی ئەوەی کە وەریان نەدەگرتین دیانناردین بۆ هەر شوێنێ کۆمەڵێ رەزالەتی زیاترمان دەبینی و دیانگوێزاینەوە بۆ شوێنێکی تر، بێ ئەوەی بزانین چارەنوسمان چی دەبێت. دو رۆژیش لە (تکریت) بە سجنی هێشمانیانەوە و جارێکی تر بردمانیانەوە بۆ (حارسیەی بەغدا) بۆ ئەو شوێنەی پێشتر و بۆ هەمان چەرمەسەری. بەلام خوا بەوە رەحمیکرد ئەمجارە تەنها یەك شەو لەوێ ماینەوە و هەر بەسجنی رەوانە کراین بۆ (حلە) بەحساب ئەمجارە دەمانکەن بە عەسکەر. لەوێش کێشەی ئەوەیان بۆ دروستکردین کە ئێمە موتەخەلیفین و ئەو شوێنە تایبەت نیە بە وەرگرتنی موتەخەلیف دەبێ بگەڕێنەوە، تەنها یەك شەو لەوێ ماینەوە زیاتر لە 200 کە دەبووین لە ژوورێکدا بووین زۆر ناخۆش و ناڕەحەت بوو. گەڕاندمانیانەوە بۆ حارسیەی بەغدا. خۆزگەم دەخواست هەر یەکەم رۆژ وەك هاورێکانم منیش رزگارم بوایا لەژیان و چەرمەسەری. ئەوە زیاتر لە مانگێکە دەمهێنن و دەمبەن بێ ئەوەی بزانم کۆتاییەکەی چی دەبێت، هیچ هاڵ و هەواڵێکی کەسوکار و ژن و منالّ نازانم، کاتێ بەرێککەوت سجنێکی تری کورد دەبینی و پرسیاری لێدەکەیت هەمووی هەر یەك جوابی هەبوو کورە کوردستان هەمووی وێرانکراو مەگەر خوا بزانێ چیان لە خەڵکەکەی کردووە. کەس نازانێت من یەکێکم لەو خەڵکانە و چارەنوسیان دەزانم، بەلام دەبوو هەوڵ بدەم ئەوە لەبیر خۆم بەرمەوە. لەو مانگەدا دەیان کوردی خەڵکی

ناوچە جیاجیاکانی کوردستان لەم زیندان بۆ ئەو زیندان بوون بە هاوسەفەرم، بەڵام جورئەتم نەکرد هیچ نهێنیەك لەو بارەیەوە بدرکێنم.

لە بەغدا دوو رۆژی تر هێشمانیانەوە و دواتر جارێکی تر ناردمیانەوە بۆ کەرکوك. هەموو ئەم بێنەو بەرەیە تەنها ئەو سودەی بۆمن هەبوو کە ئێستا گومانی هیچ شتێکی ترم لێناکرێت و وەك هاوڵاتیەك مامەڵەم لەگەڵ دەکەن کە خۆم لە چوونە ریزی سەربازی دزیووەتەوە و دەیانەوێ بمکەنەوە بە سەرباز. ئەوە بۆمن خەڵات بوو نەك سزا، چونکە من پێشتر سزام وەرگرتبوو. لە کەرکوکیشەوە جارێکی تر بە سجنی ناردمانیانەوە بۆ دوزخورماتوو.

***        ئەو ماوەیە زیاتر لە مانگێکی خایاندووە، هیچ کەسێك ناسیارێکت نەبینی بتوانی هەواڵێك بۆ کەسوکارەکەت بنێرێت هەوڵێکت بۆ بدەن تا رزگار بیت.؟**

–   مانگ زیاتر بوو نزیك 45 رۆژ بوو سجن بووم، من لەهەموو ماوەی ئەو سجنەدا و هەرکەسێکم بینی بێت هەواڵم پرسیووە، بەڵام هیچ کەس هەواڵی نەدەزانی کە خەڵکی ناوچەکەمان چیان بەسەر هاتووە، ئیتر لەکوێ خەڵکم دەستکەوێت هەوڵ بۆ من بدات. ئەوکاتە تەنها دەمویست بزانم ژن و مناڵ و کەسوکارم ماون لە ژیاندا یان نەماون. تەنها کەسێکیش

که پێشتر دەمناسی و لە سجن یەکترمان بینیووە ئەو کوڕە بوو (دیلمان) کە لەو ڕۆژەوە چارەنوسمان کەوتەیەك و لەهەموو سجنەکان پێکەوە بووین، ئەویش هیچی نەدەزانی لەبارەی چارەنوسی کەسوکارمانەوە. خواکردی ئەمجارە کە بەسجنی ناردمانیانەوە بۆ دوزخورماتوو زابتەکەی جاری پێشوو بینیمانی و سەیریکرد دەستمان بەستراوەتەوە و سەرو ریش هاتوو، دیاربوو بەزەیی پێماندا هاتەوە. کتابی بۆ کردین بۆ (جەوەڵ مەنسوریە) مەعەسکەرێك بوو لای بەغدا تا لەوێ ببین بە عەسکەر، پێی وتین بزانن لەم پۆلیسانە کەسێك راسپێرن یەکێك بدۆزنەوە ببێتە کەفیلتان. تەبعەن کەفالەتەکە بۆ ئەوە بوو کتابەکە بدەنە دەست خۆمان و لەجیاتی ئەوەی بە سجنی ببرێن بۆ (جەوەڵ مەنسوریە)، خۆمان بچین. ئێمە دێیەکانمان نزیك بوو لە ناوچەی دوزەوە ناسیارمان زۆر بوو، یەکێکمان راسپارد چوو (مەلا مستەفا)ی هێنا کە ناسیاری ئێمە بوو تا ببێتە کەفیلمان و لە زیندان ئازاد بکرێین. ئەو زابتەی خۆی پێشنیارەکەی بۆ کردین کەفالەتەکەی تەواو کرد و دامانیە دەستی مەلا مستەفا و ئەوە یەکەم قۆناغی رزگاربوونم بوو. لەدڵ خۆمەوە دەمووت ئەگەر ئەم خزمە راستیەکە دەزانێت دەوێرێت ببێتە کەفیلم، بەڵام ئەوان بەوە نازانن من لەکوێوە گەڕاومەتەوە.

کاتێ دەرچوین لە سجنەکە مەلا مستەفا پێمی ووت دایکت و ئەوان لێرەن لە دوز، هێشتا قسەکانی تەواو نەکردبوو خەریك بوو هەناسەم سواربێت ئەوەندە بەپەلە هەناسەم ئەدا، لە خۆشیدا خەریك بوو باڵ بگرم.

کەواتا کەسوکارەکەم ماون. مەلا پێمی ووت هەمویان سەلامەتن و هەر تۆ دیار نەبوویت ئەوە لە خوا بەزیاد بێت تۆش گەڕایتەوە. کاتێ ئەم قسەیەی کرد دڵم داخورپا، تۆ بڵێی حەبیب براشم رزگاری بووبێت و پێشتر گەڕابێتەوە، من تا ئەو کاتەی لە قاعەکانی تۆپزاوا بۆ گوللەبارانکردن خراینە سەیارەوە دەمزانی حەبیب براشم لەوێ بوو، بەڵام ئیتر چارەنوسیم نەدەزانی و ئەبێ دوای ئێمە ئەوان ئازاد کرابێتن. بەڵام نەمدەوێرا ئەم شتانە بە مەلا مستەفا بڵێم، بۆیە ووتم ئەی حەبیب برام.؟ وتی هێشتا سجنە و ئیشەڵا ئەویش بەردەبێت. ئیتر تێگەیشتم بەڵام نەمدەوێرا پێی بڵێم قەت چاومان پێیان ناکەوێتەوە، بۆیە بەدوای پاڕانەوەکەی ئەودا منیش ووتم ئیشەڵا.

بردمی بۆ ماڵە خزمێك کە دایکم و مناڵەکان لەوێ بوون، ئەوان هیچ زانیاریەکیان نەبوو لەسەر ئەوەی ئێمە چیمان بەسەر هاتووەو هەر نەشیان زانی بوو کە من لە دوز سجنم و وا مەلا مستەفا بووەتە کەفیلم و دەگەڕێمەوە ناویان، بۆیە کاتێ چوینە حەوشەوەو ئێمەیان بینی دایکم خەریك بوو ببورێتەوە لە تاوا ئاگای لەخۆی نەما، بۆ ئەو خۆشیەکی زۆر

بوو کە وا نزیك دوو مانگە دوو کوڕی بێ سەروشوێنە و بێ ئەوەی هیچ هەواڵێکیان بزانێ لەناکاو من خۆمکرد بەو ماڵەدا وا ئەوی لێیە، هەر خوا رەحمی کرد لەخۆشیا دڵی نەتەقی. دڵنیابووم ئەو تەنها ئەزانێ لەلایەن جەیشەوە گیراوین و ئیتر ئاگای لەوە نیە کوڕەکەی چی بەسەر هاتووە و چۆن لەدەستی مردن رامکردووە چی پەتپەتی و ئازارێکم چەشتووە تا گەیشتومەتەوە باوەشی ئەو. دایکم و براژنێکم و هەندێ لە منداڵەکان لەو ماڵە بوون و خێزانەکەم و منداڵێکم لەگەڵیان نەبوو، زۆر دەترسام کە ئەوان دەستگیرکرابن و دایکم دڵی نەیات پێم بڵێت ئەیانووت رۆڵە لەیەك دابڕاوین و دابەشبووینەتە سەر ماڵە خزماندا ئەو لە کەرکوکە. سەرەتا باوەڕم نەکرد تا زۆر سوێندیان بۆم خوارد کە سەلامەتن و لە کەرکوکن. دایکیشم پرسیاری حەبیبی برامی کرد منیش سوێندم بۆ ئەو دەخوارد کە هیچیان لێ نەهاتووە و ئیشەڵا ئەویش دێتەوە. دایکم سوێندەکەی بەڕاستی بوو کە خێزانەکەم و منداڵەکەم سەلامەتن، بەڵام من بە درۆ سوێندم دەخوارد کە حەبیب برام سەلامەتە. سێ رۆژ لای دایکم مامەوەو پاشان چووم بۆ کەرکوك لە ماڵ پورێکم چاوم بە منداڵەکانم کەوت. زۆر زەحمەتە گێڕانەوەشی ئێستا ئازارم ئەدات لەچی وەزعێکەوە و چۆن گەڕامەوە و ئایا ئەمە راستیە یان خەونە منداڵەکانم دەبینمەوە.

من دەبوو بەو نوسراوەوە وا بۆم کرابوو بچم بۆ جەوەڵ مەنسوریەو ببمە سەرباز لە جەیشی عیراقی، بەڵام دوای ئەوەی هاتمە کەرکوك و بە کەسوکارم گەیشتمەوە بڕیارمدا نەچم بۆ عەسکەری و خۆم بشارمەوە.

***  خەمی ئەوەت نەبوو کەفیلەکەت (مەلا مستەفا) تووشی کێشەیەک بێت بەهۆی ئەوەی نەچوویت بۆ سەربازی.؟**

– وەڵا دەترسام، بەڵام خزم و کەسوکارەکەم دەیانووت خۆ حکومەت غەیبی پێ نیە تۆ نەچوویت، ئەگەر لە شوێنێ خۆت بشاریتەوە و نەگیرێیت ئەوان چوزانن تۆ فیراریت تا یەخەی مەلا مستەفا بگرن. بۆیە لەڕێگەی خزم و ناسیاوێکەوە هێنامیانە سلێمانی و لەجێیەک پەنایاندام تا چوار مانگێ، دواتر عافواتێکیدا ئیتر چومەوە و سەرلەنوێ کتاب و کتابکاری وەك ئەوەی تازە تەسلیم بومەتەوە و تا ئێستا موتەخەلیف بومە. دیاربوو بەهۆی ئەوەی شەڕی ئێران و عیراقیش تەواو بوو بوو، ئەوەنە مەبەستیان نەبوو بمانکەنەوە بە عەسکەر خۆم پەنادا تا راپەڕینەکەی ساڵی 1991 لە ئۆردوگای شۆڕش لە گەڕەکی پیریادیەکان خەریکی کرێکاری بووم.

***  لەوکاتەی تۆ رزگارت بوو تا راپەڕینی 91 ماوەیەکی زۆر بوو، دایک و کەسوکارت خێزانەکەت، بەچیرۆکی رزگاربونەکەتیان نەزانی.؟**

- تا خوا ئاگاداره نە بۆ دایکم گێڕایەوە، نە بۆ خێزان و کەسوکار، تەنانەت نەمهێشت خێزانەکەم تا دوای راپەڕین شوێنی برینەکەشم ببینێ خۆ ئەوەتا ئێستاش بە جەستمەوە دیارە، بەڵام نەمهێشت کەس هەست بکات بەو جۆرە رزگارم بووە.

*** ئەی کاتێ پرسیاریان لێدەکردی چۆن رزگارت بووە، چی وەڵامێکت رێکخستبوو.؟**

- ئێمە کە لە هەردەکەی قادرکەرەم لەیەك دابڕاین، کاتێ دایکم و خێزان و منداڵەکانمان رەوانە کرد بۆ قادرکەرەم ئیتر کەسمان ئاگامان لەیەکتری نەما، ئەوان نەیاندەزانی کەی من و کاکەم حەبیب لەیەکتر جیابوینەتەوەو ئەوەشیان نازانێ کە منیش دواتر چووم لە چەم ئالیاوا تەسلیم بووم و لەگەڵ کاك حەبیب و کۆمەڵێ خەڵکی ناوچەکە یەکمان گرتۆتەوەو پێکەوە براوین بۆ لیواکەی چەمچەماڵ و تۆپزاوا. لەبەر ئەوە منیش هیچ شتێکم لەو بارەیەوە بۆ باس نەکردبوون و وتم خۆم تەسلیم جەیش کردووە و بردومیانە بۆ تەجنید دوز و سەوقیان کردووم بۆ عەسکەری و ئەم ماوەیە هەر بەسجنی ئەم مەعەسکەر و ئەو شاریان پێم کردووە تا ئەوەی بە کەفالەت ئازاد کرام. دیاربوو ئەوان بەم قسەیە باوەڕیان کردبوو، چونکە تا ماوەیەکی زۆریش دایکم هەر دەیووت بەخوا

رەنگە حەبیبیشیان بردبێت و کردبێتیانە عەسکەر ئیشەڵا لەناکاو ئەویش دێتەوە.

*** چی کاتێک راستیەکانت بۆ دایکت و ژن و کەسوکارەکەت گێڕایەوە.؟**

– دوای راپەڕینەکەی ساڵی 1991 ئەوکاتەی کەرکوک رزگار کرا، وتم ئیشەڵا سەدام دەروخێت و ئیتر رزگارمان دەبێت، ئەوکاتە هەمویم بۆ گێڕانەوە. ئەویش بەهۆی ئەوەی پێشتر هەمویان قەناعەتیان وابوو ئەو خەڵکەی گیراون هەمویان ماون لەژیاندا و دەڵێن لە تۆپزاواو دوبز و نوگرەسەلمانن، چونکە پێشتر بەهۆی لێبوردنەکەوە هەندێ خەڵك ئازادکران کە لەو شوێنانە سجن بوون، ئیتر وادەزانرا ئەوەکانی تریش بەسجنی هەمویان ماونەتەوە. زۆربەی کەسوکاری ئەنفالەکان ئومێدیان وابوو کاتێ کەرکوک رزگار کرا ئێستا سجنەکان دەدۆزرێنەوە و دێنەوە. ئەوکاتەش نەمدەوێرا بەهەموو کەس بڵێم تەنها بە ماڵی خۆمان و هەندێ خزم و کەسی نزیکم ووت کە کەسیان نەماون و هەمویان گوللەباران کراون. ئەوکاتە بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕانەوە کە چیمان بەسەر هاتووە و چۆن هەمویان کوژراون.

***   هۆی چی بوو راستیەکانت بەهەموو خەڵکت ناووت، تا کەسوکاری ئەنفالەکان زیاتر ئازاری چاوەڕوانی نەچێژن.؟**

–   وەڵایی دوو شت هەبوو یەکەمیان ماوەی راپەڕینەکە کورت بوو لەپڕ راکەڕاکەبوو سەدام هاتەوە و خەڵك ترسی ئەوەی هەبوو وەك سەردەمی ئەنفالەکە ئەوەی بەر لێشاوەکەی بکەوێت بیبات. دووەمیش ئەو خەڵکە زۆر گوناح بوون و زۆر بە هیواوە دەژیان، قورس بوو من وابکەم خەڵك بێ هیوا بکەم. سوور دەمزانی کەسیان نەماون، بەڵام کاتێ دەمبینی پیرێژنێك تاك و تەنها ماوەتەوە، یان پیرەمێردێك لەسەرە مەرگدایە و چاوەڕێی هەواڵێکی خۆشی مناڵەکانی دەکات، زۆر زەحمەتە تۆ بتوانی بێ هیوای بکەیت لەژیان. لەبەر ئەوە دەمووت وورده وورده خەڵك خۆی نائومێد دەبێت یان دەبێ چاوەڕێ بکەین تا سەدام لەناو دەچێ و ئەوکات خەڵکە خۆی بیزانێ باشترەوە لەوەی من پێیان بڵێم.

***   ئەو کاتەی سوپاکەی سەدام هاتەوە بۆ پەلاماری کوردستان، ئێوە بۆ کوێ هەڵهاتن.؟**

–   لە چەمچەماڵەوە وەك ئەو خەڵکەی تر رامان کرد بۆ (ئێران). دواتر گەڕاینەوە بۆ (تەوێڵە و بیارە) و پاشان بۆ (هەڵەبجە). تا ساڵی 1992

له (زەمەقی) بووم. دواتر ڕێکخراوەکانی سەربەنەتەوەیەکگرتووەکان له (سەیدسادق) کەمپێکیان کردەوە هاتینه کابینەکانی سەیدسادق تا ساڵی 1994، دوای ئەوە هاتینه باینجان تا ساڵی 1996 له ترسی هاتنەوەی حکومەت جارێکیتر رامان کردەوە بۆ (ئێران) له باشماخ ماینەوە و دواتر گەڕاینەوە سلێمانی ماڵمان چووە (ئەمنه سورەکە)و ماوەیەك لەوێ ژیام. له 1996/12/12 له سلێمانیەوە بەرەو تورکیا بردمانیان، ئەوکاتە بوو کە ئەوەی له ڕێکخراوەکان ئیشی کردبوو ئەیانیان برد بۆ ئەمریکا، ئێمەش خۆمان و ژن و منالەکانمان تێکەڵ ئەوان کراین و یەکەم جار بردمانیانه (گوام) دواتر بۆ (واشنگتۆن دیسی) له (ڤێرجینیا) نیشتەجێیان کردین تا ئێستا.

*** بۆ تۆ له ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکان کارتکردبوو، وا لەگەڵ ئەوان بردیانن بۆ ئەمریکا.؟**

– نەخێر، ساڵی 1992 من ئەوکاتەی له زەمەقی بووم له هەڵەبجە، ڕێکخراوی (میدڵ ئیست وۆچ) هاتنه لام و داوایان لێکردم بۆ بەیانی بچم بۆ سلێمانی، چووم چاوپێکەوتنێکیان لەگەڵم کرد. ئەوان بەدوای ئەوانەدا دەگەڕان کە وەك من له گۆڕی بەکۆمەڵ ڕزگاری بووبوو. دوای ئەوەی ئەو چاوپێکەوتنەیان لەگەڵم کرد هیچ ئاگام لێیان نەما. له ساڵی 1996

ئەوکاتەی باسمکرد مەکتەبی عیلاقاتی یەکێتیی هاتن و ئاگاداریان کردم کە شتێکی وا هەیە و دەتانبەن بۆ ئەمریکا.

ئیتر من و کاك عوزێر و کاك رەمەزان و کاك تەیمور پێکەوە کاتێ بردمانیان لە (سلۆپی) لەناو خاکی تورکیا ئەو جەماعەتەمان بینیەوە کە ساڵی 1992 چاوپێکەوتنەکەیان لەگەڵمان کردبوو، خۆیان هاتبوون لەوێ چاوەڕێی ئێمە بوون و ماوەیەك دوای ئەوەی لە ئەمریکا بووین کاك فەرەج یش یان هێنا و ئێستا هەموومان پێکەوەین. لەو ماوەیەی لە ئەمریکاین تیمی دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق هاتن لێکۆڵینەوەیان لەگەڵمان کرد و هەموومان وەك شایەتی ئەنفال و گۆڕەبەکۆمەڵەکان بانگ کراینەوە بۆ دادگا و لەبەرانبەر سەدام شایەتیماندا لەسەر ئەو کۆمەڵکوژیانەی ئەنجامی دابوون.

*** کاتێک چوویتە دادگای باڵای تاوانەکان و وەک شایەتی بەکۆمەڵکوشتنی ئەنفال لە بەرانبەر سەدام و تاوانبارانی تری کەیسەکە، شایەتیت دا، هەستت چۆن بوو.؟**

– کاتێ چوومە هۆڵی دادگاوە سەدامم بینی لە قەفەسی تاوانەکانیدا، موچڕکێکی خۆشی سەراپا لەشی داگرتم، پێش هەرشت شوکرانەی خوام

کرد ئەوە ئەنجامی زوڵم و ناهەقیە. ڕۆژانێك بوو ئەو لەم بەغدایە حوکمی بەکۆمەڵکوشتنی ئێمەی دەرکرد. ئەو بەغدایەی لە (حارسیە) لێی سجن بووم و زۆرترین نەهامەتیم تیا بینی، وا ئێستا هەر لە بەغدا سەدام بە کەلەپچەکراوی دانراوەو منیش لەبەرانبەری بە دەنگێکی زوڵاڵ بەرگری لە بێتاوانی خۆمان و شایەتیم لەسەر تاوانەکانی سەدام ئەدا. هەستێك بوو نازانم چۆن دەریبڕم، دەتوانم بڵێم ئەگەر ئەو ڕۆژەم نەبینیایا، بەهیچ شتێك و بۆ هەتا هەتایە دیمەنەکانی ناو ئەنفال لەبەرچاوم لاناچوو، بەڵام لەرووی دەروونیەوە بۆ ئێمە هەستێکی زۆر زۆر خۆش بوو، ئەوانەی بستێك زەوی نەمابوو لە ترسی سەدام خۆمانی تیا حەشار بدەین، ئێستا ئەو لە زیندانەو ئێمە ئازادانە تاوانەکانی دەخەینەوە پێشچاوی. دادگاییکردنەکەی ڕووداوێك بوو ڕەنگە پێشتر جورئەتمان نەکردبێت بە خەونیش بیبینین، زۆر گرنگ بوو ناتوانم ئەو خۆشیەی ناخم بگوێزمەوەو دەریبڕم بۆت.

*** ئەگەر ئێستا داوات لێبکەم ئەنفال لای تۆ چی دەگەیەنێت، چۆن وەڵامم دەدەیتەوە.؟**

– وەڵایی بە باوەڕی من ئەنفال قەت پێناسە ناکرێت، ئەبێ بۆ پێناسەی ئەنفال یەك شت بکەین، وابکەین هەموو دونیا بزانێ لە ئەنفالدا

چی روویداوه. ئەگەر ئەنفال وەك خۆی بناسرێت ئەوە ئیتر هەر وشەی ئەنفال خۆی دەبێتە پێناسەی تاوانەکە.

*** حەز ئەکەی لە ئێستادا بچیتەوە بۆ ئەو شوێنەی گوللەبارانکران، بچیتە سەر گۆڕەبەکۆمەڵەکان.؟**

— بەخەیاڵیش حەزناکەم ئەو دیمەن و شوێنانەم بەرچاوکەوێتەوە، بەڵام زۆر حەز دەکەم حکومەتی هەرێمی کوردستان بڕیار بدات ئەو گۆڕەبەکۆمەڵانە بێنێتەوە بۆ کوردستان. بۆ ئەوە زۆرم پێخۆشە بتانبەم تا شوێنەکەتان پیشان بدەم. چونکە دڵنیام ئێستا بڕۆم بە ئاسانی دەیدۆزمەوە و دەچمەوە سەری، شوێنەکە وا لەبەرچاومە.

*** پێتخۆشە ئەم چاوپێکەوتنە بڵاو بکەمەوە، یاخوود جارێ بیهێڵمەوە.؟**

— خۆت دەزانی پێشتر هەر مەترسیمان لەسەر بوو، بەڵام ئێستا لەخوا بەزیادبێت هیچ ترسێك نەماوە. بەڵێ حەزدەکەم بڵاوی بکەیتەوە با هەموو کورد بزانێت چۆن ئەنفالەکانیان کوشتووە و حەز دەکەم بیکەیتە زمانی ئینگلیزی با دونیا بزانێت کورد چی بەسەر هاتووە.



**نووسەر لە گەڵ ( واحید کۆچانی ) دا**

**کوردستان ـ بان موغان**

" ئەوان بۆیە ئێمەیان بردبووە ئەو سەحرا چۆڵ و هۆڵە و بۆیە

بەو شەوە کەوتبوونە کوشتنی ئێمە و بەپەلە شۆفلْ دای

دەپۆشین، دەیانویست لە خوایشی بشارنەوە چیان لەو هەموو

خەڵکە کرد.

بەڵام خوا منی بۆ ئەوە پاراست ئەو نهێنیە ئاشکرا بکەم."

واحید کۆچانی

رزگاربووی گۆڕەبەکۆمەڵەکانی نزیک رومادی

arif qurbany






# واحيد كۆچانی

ئەوان بۆیە ئێمەیان بردبووە
ئەو سەحرا چۆڵ و هۆڵەو بۆیە
بەو شەوە کەوتبوونە کوشتنی
ئێمەو بە پەلە بە شۆفڵ
دایاندەپۆشین، دەیانویست
لە خوایشی بشارنەوە چیان لەو
هەموو خەڵکە کردووە.
بەڵآم خوا منی بۆ ئەوە رزگارکرد
ئەو نهێنییە ئاشکرا بکەم.

**واحید کۆچانی دەربازبووی**
**گۆڕەبەکۆمەڵەکانی ئەنفال**







لەبلاوکراوەکانی سەنتەری مارگریت و
دەزگای روشنبیری جەمال عیرفان

لەسەر ئەرکی دکتور تەها رەسول چاپکراوە